# بەیان



ژماره (( ٨٢ ))ی مانگی ئاب ساڵی ١٩٨٢



## دووساڵەی جەنگ و سەرکەوتن و بنیادنان

# بەیـــان

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی یە

سـەرنـووسـەر : مصلح مصطفى جەلالی

لـەم ژمارەیـەدا



ناونیشان : دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی
مەیدانی خەلانی ـ بەغدا ـ ت ٨٨٧٥٧٩٥/٥خت

الاشراف الفني : شكر جاسم



بەبۆنەی یادی دووەم ساڵەی جەنگەوە

# لە یادی دوو ساڵەی جەنگی رزگاریماندا...

دوو ساڵ بەر لە ئێستاو لەگەڵ ئەوەش سەرکردایەتی دلێری حزبو شۆڕش بەهەموو شێوەیەك هەوڵی ئەدا خۆی لەشەڕ دوورخاتەوە ، کەچی فارسە رەگەز پەرستەکان دەستیان کرد بە دەسدرێژی کردن لەسەر سنوورەکانمان .. ئەوەبوو سەر لە ئێوارەی رۆژی ١٩٨٠/٨/٢٢دا ئاگری تۆپەکانیان رژاندە سەر هێزەکانمان لەناوچەی ( چوار کلاو )و بناری چیای ( بەمۆ ) لە خانەقین .. سەر لەبەیانی رۆژی ١٩٨٠/٨/٢٤دا ، دەمی ئاگرەکانیان کردە مەخفەرەکانمان لەشوێنی ( موسی الکاظم )و ( احد ) و ( عبدالرحمن الداخل )و مەفرەزەکانمان لەبناری چیای ( بەمۆ )داو ناوچەکانی ( مەندەلی )و (شۆر شیرین )و ( هەنجیرە )و ( نای خەر )و ( سیبتان )و ( سەلمان کشت )و ( جاویدشا ) یان خستە مەترسییەوە .. خانەقینیان دایە بەرتۆپی عیار (١٧٥) ملمو هەروا لە هەمان رۆژا هێرشیان بردە سەر هێزە سوپاییەکانمان لەگەلێ ناوچەدا ..

لە ( شط العرب )یشا ، گەلێ لە پاپۆرە عیراقیەکان لە رۆژی ١٩٨٠/٩/١١دا درانە بەر ئاگری رقو کینەیان ..

بەرامبەر بەم دەسدرێژیانە عیراقی بەتوانا نەیتوانی زیاتر هەناسەی درێژبێتو کەوتە خۆ..

کەچی ئەوان لە ١٩٨٠/٩/٢٢ دا هەر بەیەکجاری کاری دوژمنانەیان فراوانتر کردو شالاوێکی دڕندانەیان هێنا .. عیراق ناچاربوو بەرامبەر بەم وەزعە ، بەرەنگاریان بێ .. چ بۆ پاراستنی سنوورەکانی نیشتمانو چ بۆ پاراستنی باری ناوەخۆی عیراق ..

(( اكرم محمود ))



لــه رۆژی ١٩٨٠/٩/٤ دا کــه خومەینی بڕیاری بەرپاکردنی جەنگی‌دا ، بەســـەر عیراقا ، ســەرەتای نووچداو شکستەیی خۆی‌و رژێــم‌و تاقمەکەی لەگەڵ خۆیا هەڵگرتبوو .. شــــــەڕ داگیرساو سوپای ئازبری عیراق‌و گــەلی نەبــەزی عیراق رووبەڕووی بــەرەکــانی جەنگ بوونــەوەو رووبەڕووی هاواری نیشتمانی بوونەوەو شالاوی کینەداری رەگەز پەرستانیان تێك شـــــکاندو مەکینەی سوپایی ئێرانیان خاپوور کردو چوونــە نێو قووڵایی خاکی ئێرانەوەو گەلێ شاریان خستە ژێر دەست‌و خەونی ئاشــوپاشی خومەینی‌و دارو دەستەکەیان لەق‌و لێژکرد .. ئەم وەزعە دژوارە وای لــە رژێمی خومــەینی کرد بــەتــەواوی ورە بــەردات‌و هــاوار لـــە کۆنەدۆستەکانی خـــۆی ئەمەریکاو زایۆنیزم بکات تا بگەنە فریای ..





سەرباری ئەم سەرکەوتنە مەزنەش ، سەرۆکی فەرماندە صدام حسین لە رۆژی ١٩٨٠/٩/٢٨و دوای شەش رۆژ بەسەر هەڵایسانی جەنگ ، ئامادەبوونی عیراقی پیشاندا ، بۆ راگرتنی شەڕو چوونە نێو ووتو وێژەوە ، تا بڕیار لەسەر مافی هەردوو وڵات بدرێت ، کە لە رێککەوتنامەکاندا دەس‌نیشان کراوە .. کەچی رژێمی خومەینی جادوگەر ، لە فیزبایی خۆی نەکەوتو گشت جۆرە واسیتەیەکی خێرخوازانەی رێکخراوو جووڵانەوە رزگاری بەخشەکانی جیهانی رەفز کرد .. هەندێ لە فەرمانڕەوا عەرەبەکانیش ، ئەوانەی هەر بەناسنامە عەرەبن ، پاڵیان بە خومەینی‌یەوە نا تا شەڕ رانەگرێت .. یەکەم هەفتەو یەکەم مانگی شەڕ تەواو بوو ، وا بوو بە دوو ساڵو بەردەوام .. عیراق لەکاری ئاشتیانەی خۆی نەکەوتو بەم دواییە خاکی ئێرانیشی بەردا ، کەچی ئەو رژێمە گومڕایە هەر لەسەر موزایەدانی خۆی مایەوەو دەستی کرد بەشەڕ فرۆشتنو بەرەنگار بوونی سەر سنوورەکانمان لە رۆژهەڵاتی





شاری بەسرەدا ..

بۆیە کە ، هەموو گەلی عیراق بەکوردو عەرەبیەوە ، بە هەموو تیرەو کەمەنەتەوایەتیەکانیەوە ، بوونە یەك ریزو شان بەشانی سوپای دلێر وەستانو مامەڵەیان لەگەل مەرگو ژیانا بوو بەیەکشت ..

لەراستیدا ، رۆژانی جەنگ گەلێ داستانی مەزنی بەخۆیەوە دیو مرۆڤی عیراقیش چووە نێو حاڵەتێکی تازەوەو رۆڵەی بەجەرگی دلێری ئەم نیشتمانە ئازیزە ، هەزاران داستانی پڕ سەمەرەی نووسیەوە ، کە سەرتاپای رەنگی بڕواو خۆبەختکردنو رەوشتی بەرزو پیاوەتیو بەرگرتنی شۆڕشگێڕانە ئەرێژنو بەردەوامیش لەریزی پیشەوەی بەرەکانی جەنگدا ئامادەن ..

سلاو لە شەهیدانی نیشتمان

سلاو لە سەرۆکی فەرماندەو شاسواری رزگاری صدام حسین

سلاو لە سوپای دلێرو لەگەلی قارەمان ..





# (١٤٧) یاداشتنامە رووبەرووی رژێمی

# تـــاران ئەبێتـــەوە

لەگەڵ سەرهەڵدانی رژێمی ریســـوابووی خومەینی ، لە شوباتی ســـاڵی ١٩٧٩دا ، ئـەو رژێمە گشت جۆرە پیلانو دەســـــــدرێژیەکی دوژمنکارانەی لە دژی عیراق سازاند .. جرتو

باوکی فیـــان









فرت نەما نەیكاو ئاگر نەمـا خۆشی نەكاتو پیلان نەمـا نەیگێڕێت .. جارێ بە فرۆكەو جارێ بـە بۆردومان كردنی مەخفەرەكانو جارێ بەخـەڵـك فراندن جارێ بە تێكدانی ریزو جارێ بـە شاڵاو بردنە سەر ئاوی عیراقو دەسدرێژی كردن لـە پاپۆرەكانی عیراقو بێگانەو جارێ بـە چەتەگەری لەسەر سنوورەكان ..

جارێ بە بەكارهێنانی گشت جۆرە چەكێكو بەگشت شێوازێك ...

كەچی عیراقی شـــۆڕش ، لەم قۆناغـــە تەسكەدا هەر بینی خۆی درێژ ئەكردو نەیئەویست كـــار لـــە كاربترازێتو شیرازەی ئاشتی لـــە ناوچەكەدا بپچڕێت ، بەتایبەتیش لەوكاتەی كـە پیلانێكی فراوان بـەدەســــــت ئەمەریكای ئیمپریالیزمو دەســـــكردە زایۆنیەكەی ، لـــە ئارادابوو ..

ئەوەبوو وەزارەتی دەرەوەی عیراق ، كەوتە تۆمار كردنی یادداشتنامەكان .. هەر لە رۆژی ١٩٧٩/٤/٢٣ بگرە تا رۆژی ١٩٧٩/٣/٤ ..

لە رۆژی ١٩٧٩/٦/٢٧دا ، حكومەتی عیراق داوای لە رژێمی ئێرانی كرد ، تا هەڵوێســـتی خۆی بەرامبەر بە ریككەوتنامەكەی جەزایر روون بكاتەوە ، دوای ئەوەی‌كە لە رۆژی ١٩٧٩/٦/١٩و لـە رۆژنامەی ( اطلاعات )دا ، دكتۆر صـــــادق طباطبائی ـ قسەكەری رەسمی خومەینی ، ئـەو رێككەوتنامەیـەی رەت كـــردەوە .. تـا رۆژی ١٩٨٠/٩/٢٢ سەرجەمی ئەو یادداشتنامانەی كە ◁







وەزارەتی دەرەوەی عیــراق دابووی بـە رژێمی تاران گەیشتە (١٤٧) یادداشتنامە ، بەرامبــەر بە دەستدرێژیە چەشناو چەشنەکانی ئێران ، کە ژمارەی سەرجەمی ئەو دەســـــدرێژیانە ، تــا رۆژی ١٩٨٠/٩/٢٢ گەیشتە (٥٤٨) دەستدرێژی کردن .. بەجۆرێ کەڵەکـە کردنی نێروەکــانی ئێران لە مانگی تەموزو ئابی ســـالی ١٩٨٠دا گەیشتە ئەوپەڕی ، تا بە تەواوی شالاوەکە لــە ١٩٨٠/٩/٤دا گەیشتە لوتکە ..

بەم شــــێوەیە ، عیراق هەر لە رۆژی ١٩٧٩/٢/٢٣ وە تا رۆژی ١٩٨٠/٩/٢٢ ، گشت بەڵگەو یادداشتنامەکانی بەدەستە ، کـە چـۆن رژێمی هاروهاج بووی تاران لەو رۆژەوە شەڕی بە عیراق فرۆشتوەو دەستدرێژی لەســـــەر کردوەو پیلانی لە دژیا گێڕاوە ..

جەنگ بەردەوامەو یادداشـــــتنامەکانیش باشترین بەڵگەن ، بۆ گوناهبار کردنو دەمکــوت کـردنی رژێمی کۆنـەپـەرستی تارانو هــەمـوو جیهانیش ئەو حەقیقەتانە ئەزانێت ...

# لە پەنجەرەی ڕۆژگارەوە ...



ـ ناظم دلبەند ـ

لەگەڵ زایەڵەی دەنگی زوڵاڵی جەنگاوەرە ئازاکانی نێو سەنگەری مانو نەمان .. لەگەڵ تەقەی تۆپە تەیارە شکێنەکانی سەربازە بەجەرگەکان .. لەگەڵ هاواری پڕ لە ئازایەتیو خەباتگێرانەی فیداکارەکان بانگی سەربەستیت بۆ رادەدێرین ئەی سەرکردە ...

شەهیدانی خاكو نەتەوە ئەوەتا ئاهەنگی پڕ لە جۆشی سەربڵندیت بۆ سازدەدەن ...

سروودی مانو ژینت بۆ دەڵێنو گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ کە بە چۆڕاوکەی خوێنی گەشیان رواوە دەکەن بە ویسامی ئازایەتیو ئاڕاستەی تۆی دەکەن ئەی سەرکردە ...

**کە لە دەرگای ماڵە شەهیدێکی ئەم وڵاتە دەدرێ ، لە جیاتی هۆنینەوەی فرمێسك ، بانگەوازی سەرفرازی هەڵدەدەن .. هاوار دەکەن بژی سەرۆك ... ئەو سەرکردەی لە شەوانی مەینەتیدا خۆشەویستی بۆ جەنگاوەران دەنەخشێنێ ...**

ئەی رۆڵە سەربەرزەکانی شاخو دۆڵو زەڵکاوەکان ئێوە داستانی ئەو راستیەن کە ئەمڕۆ مێژوو دەتان ـ خوێنێتەوەو شادمانی ئازایەتیتان چاوی جنۆکەکانی تارانی کوێر کردووە .. ئەوەتا قاچاخچیو مهورەکانی تاران رۆژ لە دوای رۆژ هەرەس بە کەرامەتو ڕێچکەی سیاسەتە نا لە بارەکانیان دێتو هەراجخانە بە جەستەی گەلانی ئێران گەرم دەکەن . ئاگری پڕ لە جۆشی شەڕ خۆش دەکەنو گۆرانیبە نەشازەکانیان لەسەر قەوانە دەرزی شکاوەکان دووبارە دەکەنەوەو گوایە ڕێرەوی ئیسلامەتییان گرتووتەبەرو تەختو تاراجی بنەماڵەی رەزا شایان تەفرو توونا کردووە ... بەڵام هەموو یەکێك دەزانێ کە حوکمڕانە دوابڕاوەکانی ئەمڕۆی تاران هەمان ڕێڕەوو هەمان شێوازییان گرتووە تەنها قیناعی ساختەچییەتیان لەسەر ناوەو بە ناوی ئیسلامو ئاینی ئیسلامەوە ئەم خەڵكو خوایە دەچەوسێننەوە ...

**مێژووی پڕ شانازی گەلانی ئێران هیچ کاتێك لەوە خۆش نابێت کە تەنها بە فتوایەکی تەڵەکەبازانەو ناموبارەکانەی خومەینی هەڵقە لە گوێی ئیمپریالیزمی جیهانی بە دەیان کیژۆڵەو گەنجی بێتاوان لە شەقامەکانی تاران لە سێدارە بدرێن تەنها بە تاوانی ئەوەی کە داوای سەربەستی دەکەن ...**

◁



رۆڵە سەربەرزەکانی کوردستانی ئێران ئەوەتا رۆژ لە دوای رۆژ تێکۆشانی بێ وچانیان پەرە پێدەدەن لە شاخ‌و زەندۆڵەکانی سنەو سەقزو مەهاباد بانگەوازی فیداکارانە رادەدێرن‌و سوێند بە گیانی پاکی ئەو شەهیدانە دەخۆن کە رژێمە خوێن رێژەکەی تاران بە نارەوا گوللە بارانی کردوون کە هەتا هەتایە کۆڵ نەدەن ، ببنە عاشقی باقە نەجمەی تفەنگ لە پێناوی گەیشتن بە روناکی‌و تەفرو توناکردنی ئەم رژێمە بۆگەنەی کە مانای مرۆڤ‌و خاك نازانێ ... کە مانای خۆشەویستی نیشتمان نازانێ ...

**ئەوەتا قاچاخچیەکانی ئەمڕۆی تاران لە یەکێك لە نهۆمەکانی ئۆتێلی میترۆپۆل لە واشنتۆن پەیمانێك مۆردەکەن بۆ وەرگرتنی چەك لە ئیمپریالیزمی ئەمریکی تاکو ئاگری شەڕ هەر لە جۆش بێ‌و خۆیان دوورنجەنەوە لە هێروشیمای گەلانی ئێران ، بەڵام با هیچ کاتێك ئەوە لە بیر نەکەن کە ئەو کەلەی بنەماڵەی رەزاشای لە غەریب‌و غوربەتدا تواندەوە ، دەشتوانێ ئەپارتمان‌و تاراجەکانی خومەینی تەڵەکەباز تەفروتونا بکات .. لە رێستورانی ئەمریکادا خوێنیان دەرخوارد بدات ...**

**چاوە گەشەکانی منداڵانی عیراق ، هەمیشە نەخشەی سەرفرازی‌و سەرکەوتنی لێ‌دەنەخشێ ، لێرە لە خاکی پڕ لە شانازی‌یەوە سلاوی سوارچاکیت لێ‌بێت ، لەگەڵتانین لەو کاتانەی لە گوللەی تفەنگەکانتان ئاراستەی جەرگی دوژمن دەکەن .. لەگەڵتانین بە خوێنی ئاڵتان لەسەر بەردو دارو دەوەنەکان نووسیتان بژی سەربەستی .. بژی خاك .. بژی سەرکردە ...**

هەموو شەوێك سەربازێك بانگی فیداکاری‌و خوێن‌و شەرەفمەندیتان بۆ باس دەکات ..



هەموو شەوێك باسی ئەو مێژووە پڕ تێکۆشانەتان بۆ دەکات کە شۆڕش دروستی کرد ... لە سەنگەری پێشەوەی خەفاجیەو مەهرانو سەرپێڵی زەهاوو شوشو دیزفول ، گوێمان بە دەنگی سروود ئاشنا دەبێ .. ووشەکانی خۆشەویستی دەرئەبڕێ بۆ سەرکردەیەك کە تا ئێستا شەو لەگەڵ جەنگاوەرە ئازاکانا دەکاتەوە ... سرودێك کە خۆشەویستی دەنەخشێنێ لە دەروونی شۆرەسواری ئەم سەدەیە .. خۆی دەکاتە دیارییەك بۆ سەرکردە .. جا ئەی جەنگاوەرە ئازاکانی وڵاتی کوردو عەرەب .. تاجی گەل بە ئێوە رەوایە .. لە شەوانی بۆمبارانو تەقەی دوژمنا لایەلایەی ئەو کۆرپە نازدارانە دەپارێزن ... ئێوەن دەنگی راستەقینەی پڕ شانازی ئێمە ... بوونەتە گوێسەبانە بۆ بارانی گوللە ... ئێوەن شایانی مێژوویەکی نەبراوە ...

ئێوەن هەموو رۆژێك بووکە شووشەی خەباتگێڕانە بۆ منداڵەکان دەکەنە دیاری ..

تۆش ئەی سەرکردە .. ئەوەتای لەناو گلێنەی چاوتی هەموو مانای ، خۆشەویستیمان پێدەبەخشێ .. بەگوێمانا دەچرپێنی ، کە بجەنگین بۆ سەرفرازی گەل .. بۆ ئەوەی دوژمن خەونی زۆڵانەی نەیەتە دی .. تۆش ئەی سەرکردە ، فێرت‌کردین ، ووڵاتمان خۆش بوێ ، ببین بە قەڵغان بۆ گوللەی دوژمن .. فێرت‌کردین کۆرپەی پیرۆزی سەربەستیمان خۆش‌بوێ .. بۆیە فێربووین لە ناو تاریکی شەوەزەنگ‌دا .. لە زەندۆڵی پڕ مەترسی‌دا ... لە سەنگەری مانو نەماندا .. لەو کاتانەی بەرەنگاری دوژمن ئەبین .. بقیژێنین بە دوانەوەبن ، تەنها هەرکۆی سەرقافڵەچی‌و رابەری رێی تێکۆشانی نەبراوەمان ئەی پێشەوا چ صدام حسین » .

# یەکەم دیاری خومەینی بۆکوردستان

نووسینی : ا. ن ـ دلسۆز

خەلکی شـــاری‌سنە چاوەڕوانی میوانن چاوەڕوانی دیاری جوانن چاوی دایکوباوك چاوی براوخوشك چاوی دەزگیران ، هەموی سـەیری ئاسمانە شینەکەی شارە خنجیلانەکەی سـنە ئەکـەن ، گـوێ گوێ‌قولاغی دەنگی فڕۆکـەیـە ،

ئەم شارە چەن‌ڕوژێکە کشوماتە وەك چەن‌مانگ لەوەوپێش‌نیە کە دەنگی بڑیو بڕۆخی بگاتە ئاسمان وەك سـێ‌مانگ لەوەوپێشیش‌نیە کـە خـەلك مەستی سەرکەوتن بنو چاوسوری زالی‌بن بەسەر دوژمنا ، ئیسـتە خەلك ڕەنگی پەڕیوە خەلك هەناسـەی ئەباتەوە ناوسـینەو بۆی‌درنابێتەوە خەلك ئەلێن ، چەن ساویلکەبوین چۆن خلەتاین ،

بەلێ وادەنگی فڕۆکـە هـات فڕۆکەی هـەلـگری خەلات بۆ ڕۆلەی‌خـەبـات ، دلەلەرزەو دلەتەپە زیاتربو .... نەك دلەتەپەی شـادی نەك دلەتەپەی چاوەڕوانی میوانێکی ئازیز ... ناء ... شاری سنە چاوەڕوانی هاتنی جەللادێك‌بو بەناوی خالخالی ، بەلام دلێ باوەڕی ئەکردو چەندین دل باوەڕیان نەئەکرد کە خالخالی فەرقی دۆسـو دوژمنی لانەبێ فەرقی ئەوانەی لانەبێ کە دوێنێ پێکەوە لەیەك سەنگەرا لەدژی شا وەك قارەمـان ئەجەنگان .... لـەگـەل ئـەوانـەدا کـەلولـەی ڕەشاشەکانیان کردبوەگەل ، ئەمـە هۆی چی‌بو ؟

هی ئەوەبو کـە ئـەمـە یەکـەم تـاقی‌کردنـەوەی خالخالی بو لە کوردستانا ، فڕۆکەکە نیشـتەوە فڕۆکە تەنها نیوسەعات لە فڕۆکەخانەی سـنەدا ئەمایەوە بەنیوسـعات چی‌ئەکرێت دیارە ئەبێ خالخالی چەن ڕۆژێ بمێنێتەوە تـا لـەم هەموە دۆسیەیە بکولێتەوە .

هەموو ئەیان‌وت توبلێیت ڕژێمی خومەینی دەستی‌خۆی بەخوێنی گەلی کورد سـورکات ؟

ئەمانە هەموی پرسیاریك بون کە لەناو مێشـکی خەلکی سـنەدا لـە گێجەلولا بون ، جەللادی



سەرسپی لە فرۆکە دابەست وەیەکسەر چویە ناوژوری ئەو نۆ دیلەی کە دەسچن کرابون ، جەلـلاد مێزەرەکـەی دانـاو بەسەرکورسێیکەوە بە چوار مەشـقی بۆی دانیشت شوتێیک کەرت کرابو بۆ ئایت الله‌ی جەللاد شـوتیەکە هی کشتگەکانی سنە بو ، بەڵێ ئایەت بەدەم شـوتی خواردنەوە وەبەسەری ڕوتی وەبەچوار مەشقیەوە کەوتەناو ڕۆڵەکانی کوردستان .

بـەلام چی ڕوی‌دا دەرکـەوت کە خاڵخاڵی مۆژدەی پێیە ، موژدەی تۆتۆنۆمی بۆ خەڵکی کورد ؟ ... ناو ، دیاری پێیە ، سـلاوی گـەرموگـوڕو دوعـای خـەیری خومەینی بۆ کوردان ؟ ... نا، ئەمانەی پێ نیە ، بەڵکو گوللەو ئاگری پێیە عیزرائیلەو بۆ گیان کێشـان هاتوە ، موژدەی مەرگی پێیە .

هێمان نیوسـەعات تێنەپەڕیبو کەتەقەی ژێ سێ هەڵسا دەس ڕێژ بەشـوێنی دەسڕێژ هێمان نیوسەعاتەکە تەواو نەبوبو خاڵخاڵی سـواری فرۆکەکە بوبویەوەو لەولایشـەوە لاشەی نۆکەس لەخوێنی خۆیانا گەوزابونەوە لەو هاوینە گەرمەدا خوێنی لاوان جاریکی تر فرۆکـە خانەکەی کردەوە بـە بەهـار وەپڕی‌کرد لە سورەگوڵ سورەگوڵی ناسکونازار ، بەڵێ خاڵخاڵی نالەبار ئەو هەموە خوینەی ڕشت ئەوهەموە جوانەی کوشت ، لەگەڵ ئەوەشـا دەستی‌سور نەبو وەگۆشـەی چاکی کەواکەشی نەتلابـەخوێنـەوە ، ئـەم نـەنگەش لە ئایەتوللا دورنەبو ، جا ئیتر ئیستە خەڵکی کورد خاڵخاڵی باش‌ئەناسن بەتایبەت پاش ئەوەی بەیەکە یەکەی شارو شارۆلکەکانی ئێرانو کوردسـتانا گەڕا وەپاش ئەوەی کـە دیـاری خومەینی بـرد بـۆ هەمولایێک وەبـەشی کرماشانو پاوەو مەریوانـو سەقزو مەهابادو سەردەشتیشی بـرد وە کـەسی بێ‌بەش نەکرد .

بەڵێ لەولاوە خاڵخاڵی هەڵفڕی لەم‌لاشەوە گوڵی تەمەنی نۆ جوان هەڵوەری ، کە یەکێکیان ناصری سـەلیمی(١) وە سـیانیشیان سێ‌برابون کـە بۆرێگەی خەبـات وەك چرا بون هـەرسـێ دەسیان‌کردە ملی‌یەکو دیاری‌یەکەی خومەینی‌یان وەرگرتو بردیانەوە بۆ دایکە بێـوەو ژنـەکـەیـان بەڕاستی بەختێوکردنی سێ منالی بێ باوك چەن ستەمە مەرگی سێ‌کوڕیش بەجارێکا چ کۆسپێکی گەورەیە .

داخۆ مێژو ئەم ڕوداوەی لەبیر بچێتەوە ؟..
نا، هەرگیزاو هەرگیز .

بەلام خاڵخاڵی تا ئیسـتە سێ جاریکەش هاتوەتەوە بۆ سنە وە تا ئێستە چلوسێ لاوی ئەم شـارەی کردوەتـە قوربـانی لـەژێرپێی خومەینیدا .....

داخۆ تاکەی ئەم دێوە هـەر لە هاتوچۆدابێ تاکەی ؟

(١) وێنەی قوربانیەکانی فرۆکەخانەی سـنە لای ئەم وتارەدا چاپ‌کرێت .



ئاماده بوونێكی پته‌و ، بۆ به‌خشـــــــین‌و تێكۆشان ، هه‌تا ده‌گاته ڕاده‌ی شــــه‌هید بوون ، دیاریی گه‌له‌كه‌مانه له قادسیه‌ی پیرۆزی صدام‌دا ، نموونه‌یه‌كی به‌رزی وه‌فاداریه به‌رامبه‌ر به مێژووی دلێرانه‌ی ســــــه‌ربه‌رزی باوو باپیران ، كـه بـه توندیه‌وه ، چاونه‌ترساویه‌وه دژی رق‌و كینـه‌ی فارسه‌كان‌و ده‌ست درێژیه‌كانیان كردوه .. بۆیه نه‌ته‌وه‌كه‌مان له نێوان نه‌ته‌وه‌كاندا شـــانازی پێوه ده‌كات ، چونكه ئه‌و مافه‌ی هه‌یه ، شانازی هه‌ر مافی چاونه‌ترساوو دلێرو قاره‌مانه ..

بێگومان .. •كاربه‌ده‌سته فارسه‌كان ، رق‌و كینـه‌و ڕه‌گزپه‌رستی ، چاوی كوێر كردوون .. هه‌میشـه ده‌ســـت درێژ كردن‌و دوژمنایه‌تی كردن له‌گه‌ل ئێمه‌دا بۆ ریــــــــوا كردنی گه‌له‌كه‌مان ئامانج‌و ئاواتیه‌تی ..

گه‌له‌كه‌مان ، له هه‌موو به‌ره‌كانی جه‌نگدا بــه ئه‌و په‌ڕی توانا‌وه به‌رده‌وامن له به‌خشـــــیندا .. گــروپ گـــروپ لــه جه‌نگـدان .. ده‌جـه‌نگێن ، ئه‌وه‌كانی تری چاوه‌ڕوانی هــه‌ل ده‌كه‌ن .. ئاماده ده‌بن له‌سـه‌ر گۆڕه‌پانه‌كانی مه‌شقدا ، به شێوه‌یه‌ك ژیانی جه‌ماوه‌رانمان ده‌بێته به‌شێك له جه‌نگ .. له‌گه‌ل جه‌نگدان‌و ڕاده‌به‌ڕن .. به‌ناوی جه‌كـــه‌وه سرودو گۆرانی ئه‌لێن .. له پێناوی به‌رزبوونه‌وه‌ی پله‌ی جه‌نگاوه‌ریان .. هه‌موو شـــــتێك به‌دل‌و ســـــنگێكی فراوانـه‌وه وه‌رده‌گـرن له‌پێنـاوی قادسیه‌دا ...

جه‌نگاوه‌ره قاره‌مانه‌كانی ســــــوپای میللی ( ئه‌لێ ) كه ئاماده ده‌بن بۆ ئه‌و جێگه‌و شـوێنانـه وه‌رگرتن له به‌ره‌كانی جه‌نگدا ، شان به‌شـــــانی هه‌ڤاله‌كانیان .. ڕۆله‌كانی هێزه چه‌كداره‌كـان ،



به‌راســــــتی له دل‌و هه‌ناودا هه‌ســـــتێكی به‌رز ئه‌چه‌سپێنن .. شانازه .. ئاماده‌یه بۆ مه‌شـقی هه‌مه چه‌شـــــنه‌و وه‌رگرتنی چۆنیه‌تی ڕێڕه‌وی ئاماده بوونی سه‌ربازی له پێناوی وه‌ری هێنانی‌و جێبه‌جێ كردنی ئامانجه ئازیزه‌كانی نه‌ته‌وه‌دا .. ڕۆله‌كانی گـه‌لـه‌كـه‌مان وان .. بۆیـه ئامـاده‌ی به‌شدار بوونی جه‌نگی دووهه‌می قادســـــــیه‌ی پیرۆزی صدامن ..

ئه‌و ده‌ست‌و بازووانه كه مه‌شـــق ده‌كه‌ن بۆ فێربوونی چۆنیه‌تی به‌كارهێنانی چه‌ك له پێنـاوی به‌شدار بوونی لــه دروست‌كردنی سه‌ركه‌وتنه‌كان ... له‌پێناوی به‌رگری له شــــــه‌رافه‌تی نه‌ته‌وه‌و سه‌ربه‌خۆییه‌كه‌ی .. هه‌ر ئه‌و شێوه‌یه ده‌مێنێته‌وه هه‌تـا گه‌یشـــــتن به بنیات نانی ژیـانی نوێ بۆ گه‌له‌كه‌مان .

# بۆسوپای "قادسیەی صدام"

حسن نامق رشید

ئەوەی
لە شەوی لەدایكبوونتا
مۆمت بۆ نەسووتێنێ
شەستوو ، یەك چرا دائەگرسێنێ
ووشەی ، چیرۆكوو ، شیعروو ، هۆنراوەی
كێكی تەمەنت بۆ نەخشێنێ
دوای سەركەوتنت
كە گەڕایتەوە
جا چۆن لە ڕووی‌دێ
لە ڕووتا .. دەستی ڕێز هەڵبڕێنێ

* * *

ئـەوەی
چڵێل گڕ نەكا بەیاخەی
مەشخەڵی دەستی تێكۆشانتا
ناتوانی سبەی تۆقەیەك
گوڵێكدا لەسەر پرچی زێڕینی خۆری هیواكانتا

* * *

ئـەوەی
پشـــكۆیەك
نەخاتەكوورەی خەباتی سەختی
بیست مانگەتدا
قابلی نیە پشوودا
لە ژێر سێبەری فێنكی ساباتەكەتدا

* * *

بۆ سەربەخۆیو ، یەكسانی گەلوو :
خاكی نیشتمان

## شەستوو ، یەك ساڵە تۆ ئێشك‌گری

نەك كوڕەی جوانوو :
تێروو ، تەسەلی وولاتەكەمان
نركەی ڕەشەباو ، تۆفانی زستان
خەونی پێ‌بزڕێ

* * *

لە ناو لاپەڕەی ئێشوو ، ئازاری

## زامی حوزێران

ژانی حوزێران
« سینا » و جۆلان »ت
بە عارەقی ڕەنج خوێنی گیان نووسی
ترست نەناسی
ترست نەپرسی
لە دوای سیانزە سال
بۆ سەربەرزی گەل
سەربەستی « نەوە »
لە « ناوسۆ » وەوە تاكوو « عەببادان »
لاپەڕەكانی « قادسیەی دوومین »
بە خوێنی گیانی پاكت ئەنووسی
لە دوای سیانزە ساڵ
ڕێگای ڕزگاری « قودس »ی پیرۆزت
بە تفەنگ ناسی

* * *

كاتێك كە هێزە شڵەژاوەكەی
« خومێنی » دوژمن
هێرشت بۆ دێنی
تا سەنگەرێكت بە زۆر لێ‌سێنی
تاشوورەی پۆڵای سەختی پیاوەتی
بیست مانگ ڕەنجوو ، هەوڵ بڕووخێنێ
لە گشت بستێكی ئەم نیشتمانە

ڕۆڵەی دلێری گەل بەرەنگاری ڕەگەزپەرستی‌و دوژمن‌كاری‌و چاو برســـــێتی بۆ خاكی عێراق دەكات دوژمن لەناو ئەبات لەپێناوی قادســـیەدا هەرگیز گوڵ نادات .



# دایکی شەهید پێی وتین ..!

شیعری : ع . . س

من سەربەرزم
ماندووبوونم بۆ کوڕەکەم
وەك ڕامسپاردبوو ، وابوو
بە چکە شێرێ بوو
لە ئاگر نە ئەسڵەمییەوە
وەك پێم وتبوو :

— قارەمانبە ، ڕۆڵەی بە وەفای ئەم گەلەبە
بوو بەو کوڕە قارەمانەی
ئەوخاکەی کە ( صدام )ی شاسواری
لێ ئەوتۆتەوە ..

* * *

من سەربەرزم
نیاز خوازم
کوڕی دووەمم گەورە بێتو ڕووبکاتە
کۆڕی جەنگ
ڕێگەی منیش بدەن بجەنگمو
پاسەوانیی لە عیراقو لە سەرفرازی گەل بکەم

* * *

من بەختەوەرم
ئەی هاوڕێیانی کوڕە شەهیدەکەم
چونکە ماندووبوونم
بەخۆڕایی نەچوو .. !

# بۆ شەهیدە قارەمانەکە ..!

شیعری : ن ٠ ص

بەرەو رۆژهەلات کەوتنەرێ
لە نێو شینایی ئاسۆدا ، وونبوون
روخساریان لەنێو بیرەوەریما ، رەنگی ئەدایەوە
وشەکانیان ، وەك گوللە لە گوێچکەما
ئەزرینگایەوە ..
دیدەکانیان ، بەگیانی بەرگەگرتن‌و پیاوەتی بێ‌هاوتا
ئەبریسکانەوە ..
ئای ! لەم پیاوانە .. !

* * *

لە کۆڕی جەنگ و ئاگرا
کەوتینە رێ‌و قۆناغەکانت بڕی
بەناوی تۆو بەناوی هەمووانەوە
رووت کردە جەنگ ..
نەتئەویست ، لەپاش خۆت
ئازارو ئەشکەنجەکان جێ بهێلیت ..
مەرگ لە تۆوە دوور بوو ..

بەزاتەوە ، تۆ لە دەوری مەرگا
ئەخولایتەوە ..
حەزت ئەکرد ، بزە خەنە
ببەخشیتە ، ئەو رووومەتانەی
کە بە فرمێسکی سەرفرازی‌یەوە
دەستخست
پیرۆزت بێت .. !

* * *

ئا ئەمەتە ، مەرگی تۆ
نەبوو ، بە خەم‌و خەفەت
بوو بە شادمانی‌و .. میدالیاو سەربەرزی

* * *

حەشاماتەکە ..
ژن‌و پیاوو منال



له دەورتا کۆ بوونەوە
لە رەشێنەی دیدەیانا
ئاڵایەك بە سێ رەنگ
جەستەکەتی داپۆشیبوو
وەك بەهار ،
لەسەر دارەمەیتەکەت ، پەخش‌ببوو ..
دارەمەیتو لاشەی شەهیدێك بوو
ئەیان لاواندییەوە ،
ئەی شەهیدی زیندوو .. !

* * *

کاتێ تۆ
لە بەرەو گۆڕی نێو ئاگرا بوویت
فەرامۆش نەکرا بوویت
لە بیرەوەریما بوویت
یادمان نەکردیتەوە
چونکە تۆ هەمیشە
لە نێو یادمانا ئەژیت

* * *

خوشەویستی نیشتمان
لە شادەمارتا ، لە جووڵە دایە
تا خاکت بە خوێن نەڕواند ،
لە تاسە نەکەوتیت
خوێنت ، گوڵە خوێنی جوانی گرت :
(( با روخسارت بدرەوشێتەوە
ئەی نیشتمانەکەم
با روخساری هەموو عیراقییەك
بدرەوشێتەوە .. ))
لە ساتی شەهید بوونتا ئەمەت ووتو :
پەنجەکانیشت ،
لە خاکی پاك گیر کردبوو .. !

هۆگر گۆران


من منشورات اتحاد الادباء الاكراد في العراق

الآثار الكاملة لشاعر كردستان الخالد

عبد الله گوران

الجزء الأول

دیوان گوران

جمعه واعده وعلق عليه وكتب مقدمته

محمد الملا عبد الكريم

مطبعة المجمع العلمي العراقي

بغداد ــ ١٩٨٠

# هەڵەی چاپ لە بەرگی یەکەمی دیوانی گۆران دا

بەهۆی نزیکیمەوە لە گۆران هەندێك جار یەکەم کەس بووم کە مسوەدەی شیعرەکانیم ئەبینی یان ئاگاداری ئەوە ئەبووم کە چۆن شیعری دائەنا خولیاو پەرۆشی خۆیشم هەر لەمناڵیمەوە بۆ خوێندنەوەو ئرخاندنی شیعر بەتایبەتی شیعری ئەو ، تواناو مافی ئەوەم ئەداتێ کە خەمی هەموو ناتەواویەك بخۆم‌و لە شیعرە چاپ کراوەکانیاو ، ژمارەیەك لە هەڵەی چاپ‌و زیادو کەمی وشەو پیتەکان لەگەڵ نیشانەو سەروبۆریان دەست‌نیشان بکەم وەکو لەم لیستەیەی لای خوارەوە کردوومە کە بریتییە لە هەڵەی چاپی بەرگی یەکەمی دیوانەکەی بۆ ئەوەی خوێندەوارانی بەڕێز هەریەکە لەعاستی خۆی ئەو هەڵەو چەوتیە بچووکانە ڕاست بکاتەوە بەبێ ئەوەی ئەم کارەی من‌و ئەوان لەنرخی ئەو کۆششە زاڵ‌و دڵسۆزانەیە کەم بکاتەوە کە « ماموستا محمدی ملا کریم »و هاوکارەکانی کردوویانە بۆ کۆکردنەوەو لەچاپ‌دانی بەرگی یەکەمی بەرهەمەکانی گۆران بەم شێوە پوخت‌و نایابە .

هۆگر گۆران

| ژمارە | چەوت | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | جوانێ | جوانیی | ١٢ | ١٢ |
| ٢ | بەبزە پشکوتە | بەبزە نەپشکوتە | ١٦ | ١٢ |
| ٣ | کە دێ پاش نەمانی | کەدێی پاش نەمانی | ٢٦ | ٣ |
| ٤ | نیو کەچەی | نیو کەچە | ٢٦ | ٧ |
| ٥ | نە زۆر چاو ڕەشی | نە زۆر چاو ڕەش | ٢٨ | ١٣ |
| ٦ | نە ئێجگار گەشی | نەئێجگار گەش | ٢٨ | ١٤ |
| ٧ | لەسەر مەرگی | لەسەر مەیتی | ٤٢ | ١٨ |
| ٨ | دۆقی جارانی | دۆخی جارانی | ٤٤ | ١٢ |
| ٩ | تیژگی | تیشکی | ٤٦ | ٨ |
| ١٠ | بەسایەت | لەسایەت | ٦٣ | ٦ |
| ١١ | پاچی | پاچێ | ٦٧ | ١٠ |
| ١٢ | غەریبتا | غەریبیتا | ١١٧ | ١٣ |
| ١٣ | ئوستادێ | ئوستادی | ١١٩ | ٨ |
| ١٤ | باوکی تۆ بوو بنیری | باوکی تۆ بۆ بنێرێ | ١٢٢ | ٦ |
| ١٥ | بلبلی | بلبلێ | ١٢٣ | ٦ |
| ١٦ | ئاسمانی شنی | ئاسمانی شینی | ١٢٧ | ١٠ |
| ١٧ | لاوی | لادێی | ١٣٨ | ٦ |
| ١٨ | سەردێنێ | سەردێنن | ١٤٦ | ٨ |
| ١٩ | سا زویری | زویری | ١٧٥ | ٦ |
| ٢٠ | تەریوی | تەڕیوویی | ١٧٨ | ٨ |
| ٢١ | عەکسی | عەکس | ١٨٦ | ١٨ |
| ٢٢ | هەتاوێ | هەتاوی | ١٩٤ | ٧ |
| ٢٣ | چەماوێ | چەماوی | ١٩٤ | ٨ |
| ٢٤ | ئیشتێکە | ئێشتیکە | ٢٠١ | ١٢ |
| ٢٥ | خەمی عومرت | چەمی عومرت | ٢٠٢ | ١٤ |
| ٢٦ | گولزارە | گوڵدارە | ٢٠٣ | ٢ |
| ٢٧ | نیگام | نیگارم | ٢٠٥ | ٣ |
| ٢٨ | دادو راوی | دادو ڕواوی | ٢٠٥ | ٤ |
| ٢٩ | هەمیشە ناڕاستەی ڕێتە | هەمیشە چاوم لە ڕێتە | ٢٠٥ | ٦ |
| ٣٠ | دۆزەخێکەو گەرمی جۆشە | دۆزەخێکە وا لە جۆشە | ٢٠٥ | ٨ |
| ٣١ | بەشوێنەوە | بەشوێنیەوە | ٢١٤ | ١٢ |
| ٣٢ | پێڕەوی | پێڕۆی | ٢١٥ | ٩ |
| ٣٣ | چرچ | چەرچ | ٢١٨ | ٤ ◁ |

| ژماره | چەوت | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|---|
| ٣٤ | سەربەستو روو سوور | سەربەست بێو روو سوور | ٢١٨ | ٨ |
| ٣٥ | جەذبەیە | جاذبەیە | ٢٢٥ | ٣ |
| ٣٦ | تەسـلیەتی | تەسـلیەیی | ٢٢٥ | ١٣ |
| ٣٧ | جۆنپۆل | جۆنبۆل | ٢٣٩ | ١٦ |
| ٣٨ | کۆتری شین | کۆترە شین | ٢٤٠ | ١٣ |
| ٣٩ | بەرقی زۆر زۆر | بە رقی زۆرو | ٢٤١ | ٨ |
| ٤٠ | ئەی چەنگیزی | ئەی جەنگیزی | ٢٤٢ | ٩ |
| ٤١ | تێغی | تیغی | ٢٤٢ | ١١ |
| ٤٢ | جەورو ستەم | زۆرو ستەم | ٢٤٣ | ٧ |
| ٤٣ | میرڕیخ | مەریخ | ٢٤٣ | ١٢ |
| ٤٤ | موو پووش | موو پۆش | ٢٤٥ | ١٤ |
| ٤٥ | چە ناکەو | چەناگـەو | ٢٤٥ | ١٦ |
| ٤٦ | هەر ( یانکی ) بێ | هەر ( یانکی ) بێ | ٢٤٥ | ١٩ |
| ٤٧ | بۆ خۆشی | بۆ خۆش | ٢٥٦ | ١٣ |
| ٤٨ | لە رۆمانیا | لە رۆمانیادا | ٢٥٩ | ١٩ |
| ٤٩ | لەشـکرین | لەشکرن | ٢٦٠ | ١٩ |
| ٥٠ | ڕووی | ڕوێی | ٢٦٥ | ٤ |
| ٥١ | بەخوێنی گشت بەندییەکانت | بەخوێنی بەندییەکانت | ٢٦٨ | ١٠ |
| ٥٢ | لەبنی بێ ئەرزم | لەبن بنی ئەرزم | ٢٨٠ | ١٠ |
| ٥٣ | کۆڵدان | گوڵدان | ٢٨٠ | ١٠ |
| ٥٤ | ڕاستە بە سەربەستین | ڕاستە کە سەربەستن | ٣٢٢ | ٢٠ |
| ٥٥ | چ کاری | چ کارەی | ٣٤٨ | ٧ |
| ٥٦ | ئەم عیراقە | ئەمە عیراقە | ٣٩٦ | ٥ |
| ٥٧ | دارسـتانی | دارستانانی | ٤٠١ | ٩ |
| ٥٨ | بەلاماردە | بەلامارێ | ٤٠٣ | ٣ |
| ٥٩ | ئاهەنگی نەورۆز تۆز ئەکەم | ئاهەنگی نەورۆز قۆز ئەکەم | ٤٠٥ | ٥ |
| ٦٠ | دانانەوێنێ | دانەنەوێنی | ٤٠٩ | ٢ |
| ٦١ | ئەپـاریزی | ئەپارێزێ | ٤١٦ | ٢١ |
| ٦٢ | وەکئالتون زەردە<br>پـاکو بێ گەردە | وەك ئالتون زەرد<br>پـاکو بێگـەرد | ٤٢٧ | ٥و٦ |
| ٦٣ | چاو پیرۆزە | چاو پیرۆزەی | ٤٣٠ | ٤ |
| ٦٤ | ڕەشـانەی | ڕەشـانە | ٤٦٥ | ٩ |
| ٦٥ | گەوهەری ئادەمیزادت گشت جوان دارشت | گەوهەری ئادەمیزادت جوان داڕشت | ٤٦٧ | ٢ |
| ٦٦ | ئەو خۆی ئە کوپە | ئەو خۆی لە کوپە | ٤٧٥ | ١٠ |
| ٦٧ | لەناو دەرگادا | لەناو دووگادا | ٤٩٣ | ١٦ |
| ٦٨ | ئەی تەریحـە | ئەیقەریحەی | ١١٧ | ٥ |

لێکۆڵینەوە

ئەفسانەی :

* هێمن عبدالکریم *



# ئەفسانەی ڕێگای هات و نەهات

**لە ( هەوار )ی مامۆستا ڕەئوف بێگەرددا چیرۆکی (( ئەفسانەی ڕێگای هاتو نەهات ))م خوێندەوە ئەم تێبینیانەم ڕەچاو کرد هیوادارم سود بەخش بن .**

**نووسەر بەشێوەیەکی کلاسیکیانە پەلکێشمان دەکا بەرەو ناوەرۆکی چیرۆکەکە ، کە خۆی لەخۆیدا ڕۆمانێکە ، مەبەستم ئەوەیە کە بیری ڕۆمانێکی خستۆتە چوارچێوەی کورتە چیرۆکێکەوە ، لێرەدا نکولیم بەرامبەر بەنووسەر نیەبەو تاوانبارشی ناکەم کە بۆچی نەیکردووە بە ڕۆمان بەڵکو تەنها خۆزگەیەکەو هیچیتر . وە ئەگەر نکولیشم هەبێ ئەوە هەر ئەوەیە کە سەرەڕای ئەوەی ئەو بیرە فراوانەی بەوشێوەیە کورت کردۆتەوە تەنها ڕووداوە سەرەکیەکەی باس کردووەو سەرەتاو ڕووداوە بچوکەکانی - کە ڕووداوە سەرەکیەکەی لێپێکهاتووە - باس نەکردووە .**

چیرۆکەکە باسی دانیشتوانی دێیەك دەکات کە لە زستاندا بەفر ڕێگایان لێدەگرێتو تووشی ئازاریان دەکات ، ناموەێ لەسەرەتادا بچمە ناوەرۆکی چیرۆکەکەو ڕووداوەکانیتان بۆ بگێرمەوە بۆیە وەك بینەر بانگتان دەکەم تا بەرامبەر ئەم دێیەو دانیشتوانەکەی دانیشنو بزانن چی دەکەن .

لادێیی لای خۆمان بەڕاستی زیرەکن وە هەندێ سیفەتیشیان هەیە وەك هەر لەدایك بوونیانەوە بۆیان مابێتەوە ئەویش ئەوەیە کە هەرکامێکیان بگریت دەورو بەری گوندەکەی خۆیان بە تەواوی شارەزایەو کونبەکونی ئەشکەوتو کەندڕو شیوو دۆڵەکانی دەزانێت ، وە یەکجار زیرەکیەکەشیان لەوەدایە کە ڕێگایەك ببینن لەبیریان ناچێتەوە بەتایبەتی ئەوڕێگایانەی کە بۆ دێیەکەیان شوێنێکی گرنگی هەبێت ، خۆ ئەگەر تەنها ڕێ بێت ئەوا قەت بیریان ناچێتەوەو هەوڵ دەدەن ڕێگای تریش بدۆزنەوە .

نووسەر بەگێڕانەوەی ڕووداوێك چیرۆکەکەی دەستی پێکردووە **(( لە زەمانی مناڵی باوکمدا پیاوێکی گەلێك ژیرو لێهاتوو هەڵدەکەوێت ، دەیەوێت ئەو تەلیسمە بشکێنێ بۆیە لەگەڵ چەند پیاوێکی ئازا دەکەونە ڕێو لەگەڕانەوەدا خۆیان پۆشتە دەکەنو بەڵام هەر سەرما زۆریان بۆ دێنێو دەخزێنە ئەشکەوتێکەوەو لەوێدا دوای ئەوەی خواردنیان لێدەبڕێو ڕێی ڕزگاربوونیان لێدەبەسترێو یەك بەدوای یەکدا ڕەق دەبنەوە )).** پاشان نووسەر وێنەی دەروونی دانیشتوانی دێیەکەمان پیشاندەداو دەڵێ **(( بەڵام هێندە کارەساتەکانمان لێ نزیكبوو کەس پڕکێشی ئەوەی نەدەکرد ببێتە سەرڕەوی کاروانو ترسی ڕێگاکە بشکێنێت ))** پێش ئەم چەند ڕستەیە نووسەر بەزەقی نووسیویەتی **(( پاش ئەم کارەساتە کاروان لەو دەمانەدا قەدەغە دەکرێت ، چیرۆکی ئەم ڕێگایەش پشتاو پشت ئەکەوێتە سەرزمانی خەڵکی ))** ئەم ڕستەیە پرسیارێك کێش دەکات **(( ئایا تا ئەمان گەیشتنە تەمەنی لاوێتی هیچ هەوڵێکی تر نەدرا ؟ ئایا کۆمەڵی بچووك بچووك نەیان ویست دڕ بەو تەلیسمە بدەن ؟ )) .**

موراد دەگاتە دێ یەکەیان ، موراد ژیرو زیرەكو چاونەترسو ئازاو دنیادیدە بووە بەماوەیەکی کەم بۆتە دەمڕاستی دێیەکەو باوەڕ پێکراویان تا ئەو ڕادەیەی کە فەرمانی چ کارێکی پێ بدانایە بێسێو دوو بەجێیان دەهێنا ، تا لە دوایی‌دا نیازەکەیان پێدەڵێ کە ئەویش دروست کردنی کاروانێکی تازەیە **(( بە تایبەتیش هاتۆتە ئێرە ، تا لە ژیانی دانیشتوانیو نهێنیەکانی ناوچەکە شارەزا بێت ))** بەو شێوەیە موراد پێشڕەوی کاروان دەکاو بەڕێگایەکی تردا دەیانباتو کاروان بەسەلامەتی دەگەڕێنێتەوە .

بەڵام رویشتنو گەڕانەوەی کاروان کراوە بەچوارچێوەیەك بۆ ڕووداوێکی تری چیرۆکەکە کە ئەویش ئەوەیە کوڕێکی لاوی دێیەکە لە کاروان جیا دەبێتەوەو دەیەوێت خۆی مزگێنی گەڕانەوە بەدێیەکە بدات **(( من لاوێکی بەتوانام ئەم هاوڕازو** ◁

**سەهۆڵە ڕێگایەی لە ئێمەیان کردبووە گۆلی شێر ناتوانن شاکەتم بکەن ، پێش ئەوەی دابکاتو سەرما لەگۆم بخات ئەبێ مزگێنی گەڕانەوەمان بگەیەنم »** . لێرەدا نووسەر وێنەی لاوێکی سەرکەشی دێیەکەمان بۆ دەرئەخات « **مەڕ لە کاروان دابڕێت گورك دەیخوات** »ی بەسەردا دەسەپێتو بەڵام لەبەختی خۆی گورگ بریندار دەکاو موراد رزگاری دەکات . نووسەر بە ئارەزووی خۆی سەرو سەکتی کاردۆی شکاندووەو لەبیرکردنەوەو هەست بێ بەشی کردووەو مرۆڤێکی ڕاڕاو دوودڵی لێ دروست کردووە ـ بەرامبەر ـ ئەمیش لەلایەنەکەی ترەوە سەد قات زیرەکیو دانایيو ئازایەتی بەمراد بەخشیوە ـ بۆیە کاتێك لە کاروان دادەبڕێو دەگاتە دووڕیانێك نایەوێت بوەستێ ، لایڕاست دەگرێتو پاش چەند هەنگاوێك دەگەڕێتەوەو لایچەپ دەگرێت ، دوایی دەگەڕێتەوەو لەسەر جەمسەری هەردوو ڕێگاکەدا دەوەستێو بیردەکاتەوەو نازانێ چیبکاو نووسەریش نازانێ چی لێبکا ، بیگەڕێنێتەوە ؟ بڕوات ؟ بەکوێدا بڕوات ؟ بۆیە دەرویشێکی کولکنی لێپەیدادەکاتو ئەویش بەساویلکەيیەوە بۆ ماوەکەیەوە بەقسەی دەکاتو هەر لایچەپ دەگرێتو تادەگاتە دەرەو هەڵەنگوتێکی ترسناكو دەکەوێتە لێکدانەوە لەگەڵ خۆیدا ، لێرەدا دەیەوێت بگەڕێتەوە بەڵام چونکە نووسەر دەیەوێت ڕێی هەڵەی پێبگرێ بۆیە کابرای تەپڵەبەسەری لێ پەیدادەکات تا بەشەختەی قسە خۆشەکانی هەڵی بخەڵەتێنێو ڕێگایەکی تری پێبگرێ ، بەڵام ئایا ئەمە تا چ ڕادەیەك لەگەڵ دەروونی مرۆڤدا دەگونجێت ؟ کاردۆ پاش ئەوەی دەرویشی کولکن هەڵی دەخەڵەتێنێ چۆن باوەڕ بەکابرای تەپڵە بەسەر دەکات ؟ نووسەر دەرونی کاردۆی نیشان نەداوین تەنها ئەوە نەبێت کە بە قسەی کابرای تەپڵە بەسەر دەکاو بێ سێو دوو ملی ڕێگاکە دەگرێ ، بەڵام هەرکەسێك بکەوێتە ئەو حاڵەتەوە تۆزێك دڵی کرمی دەبێو هەندێ شت لە دەروونی خۆیدا لێكدەداتەوە « **تۆ بڵێیت ئەمیش هەڵم بخەڵەتێنێت ؟!** » وە هەندێ شتی تریش ، بە تایبەتی کاردۆ کە زۆر ڕاڕاو دوودڵە . وەلحاڵ کاردۆ زۆر لەوە ساویلکە ترە کە ئەمانە لێك بداتەوەو بۆیە دەڕواو ناونیشانی کابرای تەپڵە بەسەریش دەیگەێنێتە شوێنێکی نادیاری تر « **بەڵام زۆری نەبرد ڕێگاکە شوێنی شوێنەواری نەما** » ، نەفرەتی لە دەرویشو تەپڵە بەسەر کردو ڕق بوە ئەسپێکی سەرکێشو هەڵیگرت ، بەڵام بۆ ؟! مرۆڤێك کە بزانێ بە ڕێگایەکی هەڵەدا بردوویانەو مەبەستیان تیا چوونیەتی ، چۆن هەر مل دەنێت ؟ ئایا ڕق دەکاتە تۆڵە ؟ تۆڵە لەکێ ؟ ، بە ڕۆیشتنی بەو ڕێگایەدا هەمان مەبەستی تەپڵە بەسەرو دەروێش بەدی دێنێ ئەویش فەوتاندنیەتی جائیتر چۆن ناگەڕێتەوە ! بۆ چی دەبێت بە زۆر بڕواو هەڵدێرێ ؟ لێرەدا نووسەر بەزەیيیەکی بەکاردۆدا دێتەوەو وەك لە هەڵدێرانەکەی تێکوڕێ مورادیشی بۆ دەکاتە ڕزگارکەر تا کاردۆ پەشیمان ببێتەوەو ئیتر هەڵەشەیی نەنوێنێ « **لەوە گەیشتم تەنیایی هەڵدێرو کەوتنی زۆری تیایە ، ئەمە دوا تاقیکردنەوەی ژیانی خۆمە** » هەمان شێوە مورادیش پێی دەڵێ « **تاقیکردنەوەی ئەمجارەت هەنگاوی پەلەو بێ جەمسەرت پێنانێت** » .

بەڵام ئەگەر مەنتیقیانە بیربکەینەوەو دێیەکی وا بخەینە بەر چاوی خۆمان کە لەوەرزی بەفرو سەرمادا لە دێیەکەیاندا سەرکز دادەنیشنو بیر لە ڕێگایەک ناکەنەوە « **وەك نووسەر دەڵێ سامی مردنو نەگەڕانەوە بووبووە جا نەومرێکی چنگوپەل تیژو بەناو خوێنو دەمارەکانماندا دەگەڕا** » ئەوا بێ سێو دوو دەزانین کە نووسەر ئەو دێیەو دانیشتوانەکەی بەهەر ڕەمزێك دانابێ لەم خاڵەیاندا لە ڕاستی لایداوە چونکە لادێيی کوڕی ئازایانی زۆرە ، وە بەتایبەتیش لەوکاتانەدا دەردەکەون کە دانیشتوانی دێیەکە پێویستیان پێیانە ، بۆیە دژی ئەوە دەوەستم کە نووسەر هێڵێکی ڕاستو چەپی بەسەر بوونی کاروانی تردا ناوە وە دەڵێم هەر هەوڵدراوە ، و ئەم هەوڵدانەش وەك دافیعێكو وورە بەرزکەرەوەیەك بووەو ئاواتی دانیشتوانی دێیەکە بووە ، بەڵام بە داخەوە نووسەر دەڵێ نەبووەو بەڵکو چاوەڕێی موراد بوون چونکە دیانزانی موراد لە وەختی خۆیدا پەیدا دەبێ جا ئیتر بۆ چی ئەمان خۆیان هیلاك بکەنو بیری خۆیان ئاڵۆز بکەن ، مورادیش هیچ نەبێ هەندەرانی دیوە . لە هەمان پەرەگرافدا بەڵگەیەکیتر هەیە کە پێمان دەڵێت دانیشتوانی دێیەکە بەتەمای « **مورادی چاوەڕێکراو** » بوون

کاتێك دەڵێ « **ئەگەر چی زۆرمان بیست‌بوو کە دوور لە ئێمەش لە چەند ناوچەیەکی تردا هەمان کارەسات ڕوویداوە ، بەڵام ئێستا لای ئەوان کۆن بووەو دیاردەی وەها ڕێگایەکیان لانەماوە** » ئایا ناتوانم بڵێم کە هەرچەندە زانیویانە دێیەکانی تر لەم سامە ڕزگاریان بووە ئەمان هەرچاوەڕێی خدری زندە « **موراد** » بوون ، ئەگەر نووسەر ئەم رستەیەی بۆ ئەوە نووسیوە کە پێمان بڵێت دانیشتوانی دێیەکە بیریان کردۆتەوەو هەستیان بە دەورەو بەری خۆیان کردووە خۆدەبوایە بیرکردنەوەکەیان بیگەیاندبانایەتە ئەنجامێك ، کەچی لە چیرۆکەکەدا ئەنجامی بیرکردنەوەکەیان تەنها گۆشەگیری‌و سەرکزکردنە واتە بیرکردنەوەکەش دادی نەداون هەر ئەوەندە بە کەڵکیان هاتووە کە بیانگەیەنێتە موراد ، ئەگەر واش نی‌یە ئەی بۆ چی ماوەیەکی زۆر دەستە وەستان دانیشتوون‌و هیچ هەوڵێکیان نەداوە .

موراد چونکە هەندەرانی بوو دەبوو زیرەك بێت ، دەبوو بەتایبەت « **وەك عیلمی غەیبی پێ بێ** » هاتبێ بۆ شارەزا بوون لەنهێنی‌یەکانی ناوچەکەو ژیانی دانیشتوانی ، نووسەر هەرچەندە نەینووسیوە بەڵام بەزەقی لە نێوان ووشەکاندا ووشەی ـ تا ڕزگاریان بکات ـ دەردەکەوێ . موراد ناوچەکە لە دانیشتوانی دێیەکە باشتر دەزانی ، ئەگینا چۆن بۆ یەکەم جار سەرکاروان دەکاو بەسەلامەتی دەیان گەڕێنێتەوە ئەمەش تا ڕادەیەك لەگەڵ واقیعدا ناگونجێت چونکە دێنشین ناوچەکەی خۆی زۆر شارەزایەو وابزانم میوان لە خانە خۆی شارەزا تر نی‌یە ، وە کاتێکیش میوانێك دەچێتە لادێیەك ڕێی پیشان دەدەن‌و زۆر جار کە بە تووله ڕێیەکدا دەڕۆن ڕێ نمایی دەکەن‌و دەڵێن « **لێرە ئاگات لە خۆ بێ ، ئێرە خزە** » و چەندها ڕستەی تری ئاوا ، بەڵام موراد کە لە چیرۆکەکەدا هیچ بەڵگەیەك پاڵپشتی ناکات کە ئەوڕێگایەی بینی بێ یان پێیدا ڕۆشتبێ چۆن کوون بە کوونی شارەزا بوو ؟!

موراد دێت‌و خەڵکەکە ڕزگار دەکات‌و ڕێیەکیان بۆ دەدۆزێتەوە ، ئەگەر موراد ڕەمزێك بێت بۆ مرۆڤێك یان بیرێك ئەوا هەرگیز دروست نی‌یە دانیشتوانی دێیەکانی ترو دانیشتوانی دێیەکەمان چاوەڕوانی ئەم مورادە هەندەرانی‌یە بن تا بێت‌و پالیان بگرێ‌و وەك کوێرێك بیان بەرینێتەوە . بۆ چی نووسەر لاوێکی وەك کاردۆ « **کە دانیشتوانی دێیەکە** » دەخاتە سەر ڕێیە شوومە بێ ئەنجامەکەو تووشی ئەو هەموو هیلاکی‌یەو ئازارەی دەکا ؟ ، بۆ چی کە دەزانێ هیچ ئاواتێکی نەماوە ـ پاش ئەوەی کابرای تەپڵە بەسەر ڕێی پێشان دەداو ڕێگاکەی شوێنەواری نامێنێ ـ نووسەر ڕق دەکاتە ئەسپێکی سەرکێش‌و هەڵیدەگرێ « **نەفرەتی کە دەروێش و تەپڵە بەسەر کرد ، ڕق بووە ئەسپێکی سەرکێش‌و هەڵی گرت، شەقی لە بەفرو بەردی ئەملاو ئەولای خۆی هەڵئەداو لەبەر خۆیەوە ئەدواو لەشی کەوتە سەر ئارەقەو هەناسە بڕکێی پێ‌کەوت** » ، کاردو دەیەوێ بگەڕێتەوە بەڵام نووسەر هەر سوور دەبێت لەسەر ئەوەی کە بڕوات تا هەڵدێرێ ، ئایا نووسەر دەیەوێ بڵێ ئەو ڕێگایە ئەنجامەکەی هەڵدێرانە ؟ تا خەڵکی پەند وەربگرن ، جا خۆ هەر لە یەکەم دێڕی چیرۆکەکەدا ئەو پەندە نووسراوە کە ئەو ڕێگایەی باووباپیرانیان دەیانگرت هەڵەیە و دەیان فەوتێنێ « **وەك باوکم بۆی باس کردبووم زۆر جار کاروانی گوندەکەمان نەگەڕابوونەوە بە تایبەتی لە مانگی ڕێ بەنداندا ..... تا گەلێك کەلەپیاوو دنیا دیدەمان لە کیس چوو** » .

نووسەر بەنووکە قەڵەم دەکەوێتە یاری بە کاردو و دەیخاتە سەر ئەو ڕێگایە وەك بڵێ ئێستاش لە دێیەکەماندا خەڵکی وا هەن بەو ڕێگایەدا دەڕۆن لەم حاڵەتەشدا دەبوو کاردو یان بگەڕایەتەوەو پاشگەز ببوایەوە یان لە هەڵدێرانەکەدا ملی بشکایە ، یان نووسەر دەیەوێ بڵێ ئەی ئەوانەی بەو ڕێگایەدا دەڕۆن ، ئەگەر هەڵیش دێران مەترسن چونکە موراد ڕزگارتان دەکات واتە هەموو دەسەلاتێکی دا وە بە موراد و تاڵبی « **مرۆڤی تەواوی** » لێ‌گرتووە .

پاش ئەوەی کاروان بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە خۆی دەڵێ « **ئێستا تەواو لەم ڕێگایە شارەزان ، جارێکی تر هەڵەی ناکەن ، منیش لەناوچە یەکی تری وەك ئێرە چاوەڕوانمن بۆیە بە جێتان دەهێڵم** » واتە موراد ئاگای لە حاڵی هەموو دێیەکانەو سەرەڕای ئەوەش نیازیەتی هەموو دێیەکان ڕزگار بکات ، بەڵکو دڵنیا شە لەوەی

رزگاریان دەکات ، جا ئەی دێ نشینەکان ئەی ئەوانەی دەتانەوێ بگەنە هەوارە بەرزە هەوڵ مەدەن ، بوەستن ، سەبرتان هەبێت ئەوا موراد دێتو رزگارتان دەکاتو رێتان پێشان دەدات .

نووسەر نەهاتووە چەند لاوێکی دێیەکە هەڵبگرێو بیریان بکاتەیەكو نیازی برینی ئەو تەلیسمە بگرنە ئەستۆ ، مەبەستم ئەوەیە کە لەوەرزی بەهاردا هەموو کرنو کە لەبەرێکی رێگاکانی دێیەکەیان شارەزا بنو بیکەن بە نەخشەی کاروانی داهاتوویان لەرێبەندانی داهاتوودا رێگاکە ببڕن ، بەڵام بەداخەوە هەر سوور بووە لەسەر ئەوەی دەبێت مورادو تەنها مورادو هەر موراديش بێتو رێیان پیشانبدات ، نابێت هیچ لاوێکی دێیەکە بیرێکی پێشکەوتووی هەبێت دەبێت بێ بیر کردنەوە بن .

موراد لەبەختی دێیەکە سەرڕاست بووەو حەزی بە یارمەتی خەڵکی کردووە ، ئەی ئەگەر موراديش هەروەکو دەروێشی کوڵکنو کابرای تەپلە بەسەر یاری بە خەڵکەکە بکردایە ئەوسا چارەی رزگاربوونیان چی دەبوو ؟ ، ئایا دەبوایە چاوەرێی موراديکی تریان بکردایە ؟ یان دەبوایە خۆیان هەوڵێکیان بدایەو بە بیرێکی سادەوە **( بەڵام پێشکەوتوانەوە )** ئەو تەلیسمەیان بشکاندایە ، یان ئەم دێیە دەبووە یەخسیری مانگی رێ بەندانو وورده وورده رێگای ژیانیان وەك رێگاکەی کاردۆی پێدا رۆیشت شوێنەواری نەدەما .

دێنشین زۆر باوەڕیان بەپەندی پێشینیان هەیەو زۆری لێدەزانن چونکە زۆربەی بەسەرهاتەکان هەر لە ناوچەی خۆیاندا روویان داوەو لەمەوە بۆ ئەو گێرراوەتەوە ، پەندی پێشینیانێکمان هەیە دەڵێ (( **ئەگەر پەنجەی خۆت پشتت نەخورێنی کەس بۆت ناخورێنێ** )) بۆیە لێرەدا دەڵێم نووسەر بەبێ ئەوەی ڕابووردوی مورادمان پێ بڵێ تەنها ئەوە نەبێ (( **کامەمان گەلێك شارەزای زەوی و کشتوکاڵ بووین .... تا هەست بە نامۆیی کارو گوفتاری ناکەین** )) واتە کورە جووتیار بووەو هەندەرانی دیوەو ویستویەتی یارمەتی خەڵکەکە بداتو پشتیان بۆ بخورێنێت ، وە بە باشترین شێوە بۆشی خووراندون . جا ئەگەر موراد بیرێك بێت ئەوا ئەو ماوەیەی لە چیرۆکەکەدا دانراوە ـ لە بەهارەوە بۆ مانگی رێبەندان ـ زۆر کەمە لەچاو رووداوە سەرەکی‌یەکەی چیرۆکەکە بۆ ئەوەی دانیشتوانی دێ تا ئەم رادەیە وەری بگرن ، وە ئەگەر مرۆڤێکیش بێت ئەوا دیسانەوە ئەو ماوەیە لەوەکورت ترە کە خەڵکی دێ تا ئەو رادەیە گوێ رایەڵی بنو لە قسەی دەرنەچن .

دەروێشی کوڵکنو کابرای تەپلە بەسەری کەشکۆڵ لەکۆڵ دوو مرۆڤی ناپاکن ـ کە نووسەر تەنانەت لە ناوە کانیانەوە بۆی روون کردوینەتەوە ـ لە چیرۆکەکەدا تەنها نیشیان ڕێ پێ گۆڕینو سەرەونگوون کردنی خەڵکی‌یە ، ئەوەی لەگەڵ کاردۆشدا کردیان نیشی یەکەم جاریان نەبووە ، ئەم دوانە لە چیرۆکەکەدا ئەگەر رەمز بن بۆ کۆمەڵێك یان بیرێك ئەوا ئەتوانم ئەم پرسیارە ئاراستەی نووسەر بکەم ، **( ئەوانەی لەو رێگایەدا دەرۆیشتن لەسەرمان دەمردنو هەڵدەدیران ئەی ئەم دووانە تەنانەت ـ وەك لە چیرۆکەکەدا دەردەکەوێت ـ دژی یەکیش بوون چۆن لەکاتی خۆیدا لە شوێنی مەبەستدا ئامادە بوونو چۆن رەت نەبوونەتەوە ، ئایا بەرگری سەرمایان هەبووە ؟ )** ئەمە ئەگەر وەك مرۆڤ حسابیان بۆ بکەین بۆیە ئەو شیوە رەمزی‌یەی لەم حاڵەتەدا بەکارهاتووە دروست نی‌یە . لایەنێکی تریش هەیە کە پێویستە لە یادی نەکەین ، ئەم دەوێشو تەپلە بەسەرە خەڵکیان بە رێگای هەڵەدا دەناردو تووشی دەردەسەریان دەکردن و خۆشیان هیچیان لێ نایەت ، چونکە لە چیرۆکەکەدا پاش دابڕانی کاردۆ لێیان نە بەباش نە بە خراپ باسیان ناکرێ ، کەواتە ماوون ، بۆیە دەمەوێ بپرسم ، ئایا پاش ئەوەی خەڵکەکە رێگایان بۆ دۆزرایەوەو رزگار کران ، ئەم دووانە هیچی کارێکی تر ناکەنە سەریان ؟ بۆیە نووسەر دەبوایە پاش ئەوەی چارەی **( مورادی )** بۆ دێیەکە دۆزی‌یەوە ، چارە یەکیشی بۆ ئەم دووانە دابنایە ، من وای بە باشتر دەزانم دەروێشی کوڵکی رەق ببوایەتەوەو تەپلە بەسەری کەشکۆڵ لە کۆڵیش هەڵدێرایەو ببوایە بە خۆراکی تەلەڕەشەکان چونکە ئەم دووانە نیازیان خراپەو پاش ئەوەی بۆیاندەردەکەوێ کە خەڵکی دێ بەرێگا کۆنەکەدا ناڕۆن ئەوا بێ‌گومان

بـه جۆرێکی‌تر زیان له دێیه‌که ده‌ده‌ن‌و ده‌بنـه‌وه کۆسپ ، ئه‌وساش نووسـه‌ر ناچار ده‌بێت موراد بگه‌ڕێنێته‌وه لایان تا له‌و گیروگرفته‌ش ڕزگاریـان بکات‌و پیاوه‌تی‌یه‌که‌ی تا سه‌ر بێت .

چه‌ند دیارده‌یه‌ك له‌لادێ‌دا هه‌یـه که‌له‌شاردا که‌متره ، ئاشکرایه ئافره‌تی لادێ شان به‌شـانی پیاو هه‌موو ئیشـێك ده‌کـات « **له دروێنه‌و ، تۆو وه‌رگردن ، له وه‌ڕو چه‌نده‌ها ئیشـی تری زۆر تایبه‌ت به پیاو** » جا ڕه‌نگه ئه‌وه بگه‌ڕێته‌وه بۆ سروشتی هه‌ڵس‌و که‌وت‌و باره عه‌شـایه‌ریه‌که‌ی لادێ ، که‌چی نووسـه‌ر له حاڵه‌تێکی وادا کـه دێیه‌که تووشی گیروگرفتێکی ئاوا گـه‌وره بووه هه‌موو دێیه‌که‌ی گرتۆته‌وه ده‌وری ئافره‌تی ته‌نهـا به‌گریان داناوه « **ژیانێکی پڕ له‌مه‌ینه‌تی به‌سـه‌ر ده‌به‌ین ! زۆر جار بێ ئازووته‌یی هه‌راسـانمان ده‌کات‌و ، ماڵ‌و منداڵمان به‌سـه‌ردا ده‌گرینێ** » که واته دیسانه‌وه خانزادو قـه‌ده‌م خێرو ..... مان له‌یاد کردو ته‌نها گریانمان کرد به به‌شـی ئافره‌ت .

له کۆتایی‌دا نووسـه‌ر به په‌ره‌گرافێکی

جیاواز پێمان ده‌ڵێت که دێیه‌که ڕزگاریان بوو و ئه‌م ڕێگایه‌ش بوو به ئه‌فسـانه‌ی گوێ ئاگردانی شه‌وانی زستان . بۆیه لێره‌دا دیسانه‌وه ده‌مه‌وێت چه‌ند هه‌نگاوێك بگه‌ڕێمه‌وه دواوه‌و شـتێکی دی بڵێم ، چیرۆك‌نووس گیروگرفتێکی خستۆته به‌ر ده‌ستمان‌و له‌لایه‌نه‌که‌ی تره‌وه چاره‌نووسـی بۆ داناوه ـ به‌و شـێوه‌یه‌ی که له چیرۆکه‌که‌دا هه‌یـه ـ واتـه چیـرۆك‌نووس دێیه‌کی گیرۆده‌ی مانگی ڕێ به‌ندانی خستۆته بـه‌ر ده‌ستمان کـه ده‌بێت ڕزگـاری ببێت ، جـا گرنگ ئـه‌وه نی‌یـه گیروگرفتێك بخه‌ینـه پێش چاو ، بـه‌ڵکو گرنگ ئه‌وه‌یه چاره‌یه‌ك بۆ گیروگرفته‌که ـ به‌ڵام چاره‌یه‌کی دروست‌و گونجاو ـ پێش‌که‌ش بکه‌ین ، چونکه له حاڵه‌تی پێچه‌وانه‌دا هیچ جیاوازی‌یه‌ك نابێت لـه نێوان چیرۆك‌نووس‌و مرۆڤێکی ئاسـایی‌دا کـه ئه‌ویش هه‌سـت به گیروگرفته‌که بکات ، وه هـه‌روه‌هـا ده‌شزانین نـه‌خۆش ده‌بێت چـاك ببێته‌وه ، به‌ڵام ئایا مرۆڤێکی ئاسـایش ئـه‌مـه نازانێ ؟! که‌واته لێره‌دا جیاوازی نیوان پزیشك‌و مرۆڤه ئاسایی یه‌که ده‌رده‌که‌وێ چونکه پزیشکه‌که چاره‌و ده‌وا بۆ نه‌خۆشـه‌که داده‌نێ .

پاش ئـه‌و تێبینیانه‌ی سـه‌ره‌وه بـا سـه‌رکه‌وتوویی چیرۆکـه‌کـه‌و ناته‌واوی‌یه‌کانی به‌شێوه‌یه‌کی گشتی باس بکه‌ین ، چیرۆکه‌که وه‌ك زۆر چیـرۆکی‌تر گیـروگرفتی کۆمـه‌ڵێـك ڕوون ده‌کاته‌وه به‌گشتی‌و هی مرۆڤێکی ئـه‌و کۆمه‌ڵه‌ش بـه‌تـایبه‌تی . بـه خوێندنه‌وه‌ی چه‌نـد دێـرێکی چیرۆکه‌که خۆت به‌رامبه‌ر به گیروگرفته گه‌وره‌که‌ی دانیشتوانی دێیه‌که ده‌بینیته‌وه‌و ، نووسـه‌ر سه‌رکه‌وتووانه توانیویه‌تی وا له خوێنه‌ر بکات که تا ڕاده‌یه‌کی زۆر له‌گه‌ڵ گیروگرفتـه‌که دا بژی‌و هه‌سـت به موعاناتی خه‌ڵکی دێیه‌که بکات‌و چاوه‌ڕێی چاره‌سـه‌رو کۆتایی هـاتنی ئـه‌و گیروگرفته بکات « **به گوێره‌ی گوره‌کـه‌و خه‌ڵـکی دێیه‌که** » و خۆشی تا ڕاده‌یه‌ك چاره‌سـه‌رێکی له مێشکی خۆیدا دانابێت .

که چیرۆکه‌که‌م خوێنده‌وه هه‌سـتم به‌و شتانه‌ی سـه‌ره‌وه‌کردوو که له چیرۆکه‌که‌ش بوومه‌وه زۆر پرسـیارو بۆ شـایم ـ به‌پێی بیرکردنه‌وه‌ی خۆم ـ لـه چیرۆکه‌که‌دادی چونکه چـاوه‌ڕێی ئـه‌و کۆتایی‌یه‌م نه‌ده‌کردو وه‌ك وتم نووسه‌ر چاره‌سه‌ری گیروگرفتێکی به‌شـتێك کردووه که خۆی پێویستی به چاره‌سـه‌رهه‌یه . وه‌ك ئه‌وه وایه نادیارێکی به نادیارێکی تر پێناسه کـردبێت ، چونـکه پـه‌یـدا کردنی ئـه‌و موراده ـ ناڵێم نی‌یه ـ به‌ڵام پێویستی به چاره‌سه‌رهه‌یه ، که‌واته بۆ ته‌نها گیروگرفته سه‌ره‌کی‌یه‌که نه‌گرین‌و نه‌ك ته‌نها مورادێك به‌ڵکو چه‌ند مورادێکی خه‌ڵکی هه‌مان دێ په‌یدا نه‌که‌ین‌و ئه‌و گیروگرفته بگرنـه ئه‌ستۆی خۆیان ـ شـه‌رت نی‌یه کتومت وه‌ك موراد بن به‌ڵکو ئه‌وه‌نده به‌سه له چه‌ند سیفه‌تێکی سـه‌ره‌کیدا وه‌ك یـه‌ك وا بن و نیازیان بڕینی ئـه‌و ته‌لیسمه بێت .

وه‌ك تێبینی‌یـه‌ك ئـه‌مـه‌وێ ئـه‌وه ڕوون بکه‌مـه‌وه کـه ئـه‌م چیرۆکه‌م « **لـه هه‌وار** » دا خوێنده‌وه‌و تێبینی یه‌کانم ته‌نهـا به‌رامبـه‌ر بـه‌و چیرۆکه نووسیوه‌و خۆم نه‌خسـتۆته داوی چیرۆکه‌کانی تره‌وه .

لـه کۆتایی‌دا ئـه‌مـه‌وێ بڵێم هیـوادارم بۆ چوونه‌کانم مه‌نتیقیانه بن‌و هیچی تر .

# پاڵەوان لە ئەدەبی جیهانیدا

نووسینی : بۆریس بۆرسۆڤ
گۆڕینی : فۆاد عبدالرحمن

ئەدەبی مۆدەرنیزم ئیمڕۆ لەدایك نەبووە بەڵکو لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە ، لە فەرەنسادا سەری هەڵداوە . هەر لەو سەدەیەشدا پاش چند دەها سابێك ، لە وڵاتی ڕووسیادا سەری هەڵداوە . بۆیە لەم ڕۆژانەماندا بۆ چوونێك لە بارەی ڕێرەوێکی ئەدەبییەوە بە وشەی مۆدەرنیزمەوە بەستراوە . ئەو ڕێڕەوە ئەدەبییەش زۆر لە مێژەوەیە ڕەگی خۆی داکوتاوەو لە هەموو قۆناغێکیدا وەك دژ بە ڕیالیزم خۆی خستۆتە ڕوو دژایەتی نێوان ڕیالیزمو مۆدەرنیزمیش لە پێناوی وأتایەك لە واتاکانی وینانەنی مرۆڤ دروست بووە . ئەم دژایەتییەش بەهەموو ئەدەبی ڕۆژئاوادا بڵاوبووەتەوە . لە ژمارەی تەمووزی ساڵی ١٩٦٤ دا ، لە گۆڤاری « بۆلیتیکا »ی پۆلۆنیدا ، ئەم وتارەی ( ڕۆجی گاروودی ) بڵاوکراوەتەوە.. کە تیایدا دەڵێ :

« لە دوای جەنگی جیهانی دووهەمەوە . سەدەکەمان هەنگاوەکانی خێراتر بووە ، لە ماوەی بیست ساڵدا ئەوەی داهێنرابێ زۆر زیاترن لەو بەرهەمانەی کە لە ماوەی چەند سەدەیەکدا داهێنراون مەسەلەی چارەنووس مرۆڤو تازەکردنەوەی جیهان زۆر بە تەمووژیو نهێنییەوە لە لایەن ئەو کەسانەوە پێشوازی دەکرێ کە لەم هەموو بەرەو پێشەوە چوونو تەقینەوانەدا جگە لە ئازارو ئەشکەنجەو ڕاچەنینی تراژیدی چیتریان بەدی نەکردووە . هەر ئەمەش بووە بە هۆی سەرکەوتنی «وجودیەت» لە ناو ڕۆشنبیرەکانی دوای جەنگدار . مەبەستم لێرەدا لەو ( وجودیەت )ەیە کە بووە بە هۆی سەرنج ڕاکێشانی ئەو گیروگرفتە ڕیاستییانەی کە بەستراون بە موعاناتو لێپرسینەوەو دوودڵیو

ئازادییەوە . بەڵام ئەو ـ واتە وجودیەت ـ ە لە بابەت ئەم پرسیارانەوە هەندێ وەڵامی میتافیزیکییانەی داوە بەدەستەوە . وەك کەسایەتی ( الفردیة ) و لاوەکیو بێ هودەیی ... با ئێمەش لێرەدا وەڵامێکی دیکەی پرسیاری ئەم چەرخەمان بدەینەوە لە توانای ئێمەدا هەیە ، هەر لەمەشدا بوارێکی بنەڕەتی سەبارەت بە هونەرو بیری سۆشیالیستیانە بەدی دەکەم » .

هەموو هونەرمەندێکی راستەقینە دەتوانێ وێنەی ئەم چەرخەمان بخاتە بەرچاو . لە هەچ بارێکەوە بێ [redacted] ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە کە ئایا سەر بە چ بیرو باوەڕێکە .

لێرەدا ئێمە بە تەواوی لەگەڵ راکەی ( ڕۆجێ گاروودی ) داین بۆیە ناتوانین وشەکانی بەجۆرێ تێبگەین کە هەچ بەرەو ڕووبوونەوەیەك لە نێوان ڕیالیزمی سۆشیالیستیو ڕیالیزمی رەخنەکاریدا بکرێ ، ڕەگەوە کارێکی هیچ دەبێ .

بەلای منەوە ئەم وتانە گلەیینو لە خۆمان دەکرێن .

لەڕابوردوودا هەندێکمان ڕیالیزمی ڕەخنەکاری تەنها بە کۆمەڵێ کاری ڕەخنەگرتن دەدەن لە قەڵەم . بەڵام ، چەند ساڵێکیش دەبێ ، کەس بەم شێوەیە نانووسێ . بەلامەوە ئەدەبی سەدەی نۆزدەهەم ، بۆ نموونە ، بە ئەدەبی ئایدیال نموونەی ( المثل العلیا ) دادەنرێ . بەڵام هەرگیز ئەوە نابێت بەبناغەیەك بۆ لەناوبردنی جیاوازییەکانی نێوان ئەدەبی سۆشیالیستیو ڕیالیزمی ڕەخنەکاری .

« ڕۆمێ گاروودی » دەیەوێ بە زۆر ئەوە بسەلمێنێ کە هونەری ڕیالیزمی سۆشیالیستی میراتی تێکڕای کەلەپووری هونەری پێشینە :

**« ... ئێمە بەهەڵەیەکی زۆر گەورەدا دەچین لە ولاتێکدا ( کە دەتوانین ، وەك لەو باوەڕەدام ، بەبێ هیچ شۆڤێنییەتێك ، بڵێین )**

**کە بەلایەنی کەمەوە بەدرێژایی سەد ساڵ مەیدانی چەندین ڕێبازی تازەی وێنەکێشان بووە ، لە هەموو لایەکی جیهاندا پێی وتراوە ( قوتابخانەی پاریسی ) . ڕێگا بە خۆمان بدەینو باوەڕ بەوە بهێنین ( ئەگەر چی بەبێدەنگیش بێ ) کە هونەرمەند بتوانێ ببێت بە ڕیالیزمییەکی سۆشیالیستیو کاری هونەری وێنەکێشان بکات ، هەر وەکو ( سیزانو گۆگانو ماتیسو لێژێ )و هونەرمەندانی تری هاوچەرخ.. نەهاتینە دنیاوە .**

**ئەو هونەرمەندەی کە گوێ بەم تاقیکردنەوەیە نەدات ، تەنانەت ئەگەر داواشی لێکرابێ شتی جوانو سەرسوڕهێنەر بخولقێنێ ، ناتوانێ لەسەر هەمان ڕێگای هاوچەرخەکانی خۆی بڕوات .**

**چونکە ئەم کارە لەوە دەچێ کە کەسێك بەزمانی لاتینی باسی نرخی ( سیبێرنیتیکا ) یان سۆشیالیزم بکات . هەر مرۆڤێك ئەگەر سەر بە ڕیالیزمی ئەم سەردەمە بێ ، بەتایبەتی ڕیالیزمی سۆشیالیستی، بێگومان دەبێ ڕیالیزمییەکی هۆشیار بێ ، بەمانای قوولی ئەم سەردەمەمان ، کە سەردەمی هەنگاونانە لە قۆناغی سەرمایەدارییەوە بۆ قۆناغی سۆشیالیستیو ، لێپرسینەوەی مرۆڤ بەرامبەر بەم مەسەلەیە .**

**هەڵبەت ئەو هونەرمەندەی کە بتوانێ سوود لە کەلەپووری هونەری ڕابوردوو وەربگرێ ، لەسەر بناغەی ئەم سوود وەرگرتنەوە زۆر ڕێگای تازەتر بۆ دەربڕین دەدۆزێتەوە . ئەو ڕێگا تازانەش لەگەڵ گیروگرفتەکانی ئەم چەرخەماندا دەگونجێن . بێگومان بەتەنها هونەرمەندیشە کە بتوانێ ببێت بەو کەسە ڕیالیزمییە » .**

لە بنەڕەتدا هیچ شتێکی ئەوتۆ بەدی ناکەم کە لەگەڵ ( ڕوجێ گاروودی )دا لەسەری ڕێكنەکەوم . کێ هەیە ڕەخنەی لەوە هەبێ کە هونەرمەندی هاوچەرخ پێویستە خۆی بەخاوەنی ئەو ڕێگایانە دابنێ کە بەرەوپێشەوە چوونی هونەری ڕابوردوو خواستوونی ؟ بەڵام ئەوەی جێگای سەرنج بێ ، هەڵبژاردنی پسپۆرانەی هەندێ ( ناو )ە . بەهەرحاڵ . هیچ هونەرمەندێك ناتوانێ ببێت بە ڕیالیزمی تا ئەوکاتەی لە ئەزمووی ( سیزانو ماتیسو گۆگانو لێژیە ) نەگاتو ئەو ئەزموونە بەرەوپێشەوە نەبات .

بەڵام ئەو هونەرمەندەی بیەوێ بەپلەی ◁

ڕیالیزمییەکی هاوچەرخ بکات ، نابێ تەنها لەناستی تێگەیشتن لەوانە بووەســـــتێ . بەتایبەتی کــە ( ڕۆجێ گاروودی ) بۆ مەسەلەی سوود وەرگرتنی هونەرمەند لــە ئەدەبو نــەریتی ڕیالیزم بێدەنگ دەبێ .... ( ئەرنســـت فیشــــەر ) لە هەمان هەڵویست بەرگری کردووە . لە هەندێ ڕاکانیدا

کە لە کتێبی « ئەدەبو گیانی سەردەم »دا بڵاوی کردوونــەتــەوە ، زۆر نزیکن لـــە ڕاکـانی ڕۆجێ گاروودیەوە : بۆ نموونە دەڵێ : « دژایەتییەکانی نێوان ئەو ڕژێمانەی کە دژ بەم چەرخەمانن بوون بەهۆی نەهێشتنی هەندێ ســـــنوور لەنێوان ئەرکەکانی هونەری سۆشیالیستیو ئەو هونەرەی کە لەگەڵ ئەوەی بۆرژوایانەیە ، لە بنچینەدا دژی

سەرمایەداری دەوەستێتەوە . بەڵام ئەمــە ئــەوە ناگەیێنێ کە هونەری سۆشیالیستی ئەفرەت لــە ناوەڕۆکە سۆشیالیستیانەکەی خۆی بکات ، بەڵکو ئەوە دەگەیێنێ کە شارەزای هەموو ئەو لایەنانەیە کــە هاوچەرخن . هەروەهــا نــاچــار نییە لــە ڕێبەرکیکردن بترسێ ، چونکە بیرکردنەوەکانی ئەم لــە زۆر بیرکردنــەوەی تــر بەرزترنو بــەردەوام تاردەکەنە سەر جیهان .

( گۆرکیو مایکۆفســـــکیو تۆلســـــتۆیو نایزنشتینو بۆدۆفکین ) بەهۆی بەرهەمەکانیانەوە توانیویانە جەماوەرێکی زۆر جگە لەوانەی سەر بە بەرەی سۆشیالیستین بەلای خۆیاندا ڕابکێشــن .

بە پێچەوانەی ئەمەشەوە ( شــابلنو دیسیکاو فۆلکنەرو هەنگوای توانیویانە جەماوەرێکی زۆری ســـــەربەبەرەی ســـۆشیالیستی بەلای خۆیاندا ڕابکێشن . ئەگەر چی هەر یەکە لە ئێمە ســـەر بە ڕژێمێکی کۆمــەڵایــەتی تایبەتییەو هەریەکەمان بیروباوەڕو ئامانجی تایبەتی خۆی هەیە ، لەگــەڵ ئەوەشـــدا هەموو پێکەوە لەنــاو یەک جیهانێکدا دەژین . ئەم جیهانەشــمان نــاتــوانێ چ ئەدەبی ســـــــۆڤیــاتیو چ ئــەدەبی ئەمریـکاییو چ مۆســـــــیقای رووسیو یاخـود فەرەنســیو یاخود نەمساوی ڕەتبکاتەوە . هەروەها لەتوانایدا نیە سینەمای ئیتالی یان ژاپۆنی یان ئینگلیزی یــان ســۆڤیاتی ، یان هونەرمەندە مەکسیکییەکان یــان ( هینری مۆر ) یان ( برێشت ) یان ( ئۆکسیس ) یان ( شاگال ) یان ( بیکاسۆ ) ڕەتبکاتەوە .

دژایەتییەکانی نێوان ڕژێمە کۆمەڵایەتییەکانو خەباتی چینــایەتیی جیهــانیی ـ مێژوویی هــەر بەردەوام دەبێ . ئەم خەباتی چینایەتییەش ئەگەر لەبارو زرووفێکی ئاسایشیدا بێ ، ئەوا بناغەیە بۆ بوونمان .

**« ڕاســـتی بوونی خەڵکی ، لێرەو لەوێ ، قســـــەی پرووپووچ نەکردنو تێگەیشـــــتنیان لەیەکتری ، بێگومـــان بوو بەهــۆی داهێنـــانی بەرزترین کاری هونەریو ئەدەبی » .**

لێرەدا ئەم دوو پرسیارە ئەوە دەچن ، کــە تێـکەڵ بەیەکتر ببن . چونــکە جیاوازییەك هــەر هەیــە لــە نێوان ئــەوەی وەك ڕاســـــتییەك دان بەهونەری مۆدەرنیزمدا بنێینو لەنێوان ئەوەی کە بە لووتکەی ڕیالیزمی دابنێین . بێگومان ناشتوانین چاوپۆشی لەوە بکەین کــە باشترین هونەرمەندانی مۆدرنیزم ئەوانەن کــە هــەر یــەکــەیان لە ڕێگای خۆیەوە گیانی ئەم ســـەردەمە دەردەبڕێ . وەکــو ئەوەی ( ئەرنســـت فیشـــەر ) پەنجەی بۆ درێژ کردووە . بەڵام ئەمە هەرگیز ئەوە ناگەیێنێ کـــە ســـــنوور لە نێوان ( ڕیالیزم )و ( مۆدەرنیزم )دا نەمێنێ .

جیهــانی هونــەری مۆدەرنیزم ، زۆر کـات جیهانێکی روون سەربەرو ناسکە . تارمایی نیە ، بەرزەو بێ وەستاوەو تەنها وەك ئەندێشــــــەی هونەرمەندێکی مۆدەرنیزمی نابێتە پێشچاو .

پاشـــان ، هونەری مۆدەرنیزم ، بــە ڕادەی هونەرێتی خۆی ، جیهانمان پێدەناسێنێو دەبێتە لاپــەرەیــەکی دەگمەن لـــە مێژووی هونــەردا .

ڕەخنەگری مارکســـــیزمی ئینگلیزی کە « دێڤید کــریــج »ە دەڵێ : « مۆدەرنیــزم دۆڕانــدنێــکی موتلەق نیە » .

ئەم پرســــــیارە بە بۆنەی هەندێ داهێنانی هونەرییەوە لەلایەن مۆدەرنیزمییەکانەوە خراوەتــە ڕوو .

لەکاتی خۆیدا ، ( جۆرج بلیخانۆف )یش ئەم پرسیارەی کردووە . تیایــدا ئەوەی دەستنیشان

کـردووه کــه هونـەرمـەنـدە مۆدەرنیزمییەکان توانیویانە ژمارەیەك لە « مەسـەلەی تەکنیك »ی « زۆر بەنرخ » پێشکەش بکەن .

باری سەرنجی ( بلیخانۆف )یش ئاراستەی ئەو ( تیشکانە ) دەکرێ ، کــه لـه ناو بەرهەمی هونەرمەندە مۆدەرنیزمییەکاندا هەن .

( بلیخانۆف ) ئـەوەی دەستنیشان کردووه کە ئەم « هۆیە تەکنیکییانە » ڕێگای باشـتر لەبەردەم مرۆڤدا دەکەنەوە، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی جوانتر سرووشـت ببینێ و هێزو توانایی زیاتری پێبەخشێ [illegible] « بارمتەی چێژ وەرگرتن لە خۆیدا زیاتر بکات .. » .

شێوازە هونەرییە تازەکان تەنها لەو کاتانەدا نرخیـان دەبێ ، کــه لـه ڕادەی توانـاییمان بەرزبکەنەوە بۆ ناسینی جیهان و مرۆڤ . لەوێدا ، وەك ئاشکرایە ، شانۆی ( عەبەس ) . کە دەوترێ « برێخـت » حەزی کردووه شانۆگەرییەکەی « پیکێت » کە بەناوی ( لەچاوەڕوانی گۆدۆدا )یـه وەك نموونەیەکی درامـای عـەبـەس دەربهێنێ . دەشتوانین باوەڕ بەوە بکەین ، بێ گومان ، کــه برێخت نەیدەویـست تەنها هەندێ ئامانجی ڕووکەشی بەدیبهێنێ .

لە وتارێکی « جاك سازر لاندر » کــه لــه ڕۆژنامەی « دەیلی وۆرکەر » لە پێنجی تشـرینی یەکەمی سـالی ١٩٦٤ دا بلاوکراوەتەوە ، هەندێ ڕاو بۆچوونی « شوون ئوکیـی » مان بەر چـاو دەکەوێ ، کە دەربارەی ژمارەیەك لە نووسـەرانی ڕۆژاوای ئەم چەرخەن ، بەتایبەتی « سـامۆئیل پێکیت » ، « ئۆکیـی » بـەلایـەوە « پێکیت : **« شـاعیرێکە بەرهەمەکانی بریتین لە رووحی گالتەوگەپو مۆسیقایەکی تایبەتی تەنها پێویست دەکات گوێ لە وشەکانی بگیرێ لە سـەر زمانی هـەنـدێ ئەکتـەری لێهاتوودا کــه مەنـەلۆجەکە پێشکەش دەکـەن یاخود شانۆگەرییەکە دەنوێنن ، بۆ ئەوەی وەك بینەرێك هەسـت بەم ئاوازە مۆسیقییە بکەیت و جارو باریش بە سـۆزێکی قوول و ماتییەك و گالتەیەکی کاریگەرو خەماوییەوە پێوەی ببەستریێتەوە »** . ( ئۆکیـی ) ( پێکیت ) دەخاتە ڕیزی ( کافکا )و ( ئیۆنیسکۆ )و ( کامۆ )وە.

پاشان بەردەوام دەبێ و دەڵێ : لە نووسـینەکانی ئەمانەوە دەتوانرێ بۆمان دەرکەوێ **« کـە بێزاریی ڕۆشنبیرانی جیهانی ڕۆژاوایی لە پاکیەوەیە »** .

ئەمانە بەشێکن لە مەجەڕەی **« ئەو ئەسـتێرە تەماوییانەی کـە لەوانەی ئاسـمانی مرۆڤایەتی لێڵدەکەن »** .

ڕیالیزم – بێگومان – بواری دەربڕین فراوانتر دەکاتەوەو تیژتر دەڕوانێتە زۆرترین مەسـەلەی کاتی و تازەترین شێوازی هونەری بەکاردەهێنێ کە هونەری مۆدەرنیزمیش بەکاریدەهێنێ . بەلام ئەم کارە سـنووری نێوان ڕیالیزم و مۆدەرنیزم ون ناکات . هەر وەکو ( ئەرنسـت فیشەر ) باوەڕی بەوە هەیە کە ڕیالیزم بەم شتە زۆرتر هەسـت بە ئەرکی تایبەتی خۆی دەکات .

ڕیالیزم نیشانەکانی زۆرن ، یەکێك لەوانـه توانایی بێ پایـانی و ئامێز کردنەوەی بۆ هـەمـوو بەرهەمی ئەولایەنانەی کە لە هونەردا ڕیالیزمی‌نین ئەمەش لـەبـەر ئەوەیە کـە ڕیالیزم لێکۆلینەوەی جەربەزانەو باوەڕی بتەو لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە .

باوەڕی بتەویشی لەبەر ئەوەیە کە لەشـت دەکۆلێتەوەو لە لێکۆلینەوەشیدا تاسـەر دەڕوا لەبەر ئەوەی باوەڕی بتەوی پێ‌ی هەیە .

لەم بوارەوە ڕەخنەگری ڕۆمانی « جۆرجینتۆ خورودینکە » بە شێوەیەکی زۆر پوختەو جوان لە وتارێکیدا بە ناوی « دەربارەی پێوانەی بنەڕەتی و گیروگرفتی ڕیالیزم » . کە ڕۆژنـامـەی « ئەدەبی ڕۆمانی » لە یانزەی شوباتی سـالی ١٩٦٥ بلاوی کردۆتەوە تیایدا دەڵێ : « ژیانی ئەدەبی هاوچەرخ بریتییە لـە دیاردەیەکی دژبـەیـەك :ـ لەلایەکەوە دژایەتی و لەلایەکی ترەوە ئالوگۆر کردنی هـویـە هونەرییەکانی نێوان ڕیالیزم و لایەنە ئەدەبییەکانی‌تر بەلام لـەگـەل ئەوەشدا دەتوانین ، بـە هـەموو باوەڕێکەوە ، بلێین کە ڕیالیزم تەنها شـەپۆلێکی ئەدەبییە کە بەربەرەکانی فەلسەفەی ( عەقلانی )و گومانکردن و نیـسبیەت و ( اللا ادریـة )ی لـەنـاو ( ئەدەب )دا بکات .

هەروەها دەتوانرێ ، بەبێ هیچ ترسـێك ، دەربارەی مانای گەورەی نووسەرێکی گەورەی وەك ( فۆلکنەر ) بدوێ ، ئەگەر چی فۆلکنەر نووسـەرێکی

ریالیزمیش نیە ...... هەروەها دەتوانین ، بەبێ ترس ، باسی بەشـــداریکردنی ( وجوودیەت ) بکەین ، لـــە ناســـینی دەروونی مرۆڤـایەتیو دۆزینـــەوەی ژیـانی ئـالـۆزی ناوەوەی مرۆڤو دژایەتییە نارەوشتییەکان ... هەروەها دەتوانین هەولدانەکانی (( رۆمانی تازە )) هەلبسەنگێنین بۆ **رزگارکردنی پالەوان لـەو رووەوە کە مرۆڤ لـە رووی هەســـتە تایبەتییەکانیو فەرمانەکانییەوە دیاری دەکات . ئـەم جۆرە داپنیانانـە لـە نرخی ریالیزم کەم ناکاتەوە کە هەمیشە ســـەرکەوتنی لەبەردەمدا بێ ، ئەو ســـەرکەوتنەش لە ئەنجامی ئەو داهێنانەوەبێ کە لەلایەن رێبازە ئەوروپاییەکانی ترەوە دەکرێن . بەلام ئەگەر بەبێ مەرج ، بیر لـە گرتنە ئامێزی راو بۆچوونی ئەم نووســـەرانە بکەینەوە ، ئەوا ئەوکاتە دەبێ ببین بە (( وجوودی )) یاخود ببین بە لایەنگری فەلسەفەی (( عەبەس )) .**

**دەڵێین نامۆبوون یەکێکە لە یاســاکانی ئـەم چەرخەمان . بەلام ئەم یاسایە هێزی رووخانـدنی**

**رۆلەکانی ئەم چەرخەمان دیاری دەکات . بەهـەر حال ئێمە نابێ تەنها بایەخ بە رووخاوەکان بدەین ، بەلکو دەبێ بایەخ بەو کەسانەش بدەین کـە دەبێ سەربکەونو ئەو کەسانەش کــە ئێســتاکە لـە سەرکەوتن دان . هەر ئەمانەشن بەرادەی یەکـەم جێی بایەخ پێدانی ئێمەن )) .**

بەلام هەندێ کەســـان هەن بۆ لایەنێك دەگەرێن خۆیانی تیا بشـــارنەوە ، ئەوەی کـــە شایەنی باسە یەکێك لە چیرۆکەکانی (( کافکا ))ش بەناونیشانی ( لانە )یە . بـەلام ئـەم لانـەیـە نابێ بەهۆیەك بۆ رزگارکردنی کەسێك کە بیەوێ خۆی تیا حەشار بدات.چونکە ئەم لانەیە هەرگیز ئامانو دلنیایی تێدا نیە . ئەو کەسەش کە بیەوێ خۆی حەشـــــار بدات خەمی خۆحـەشـاردانو خۆشـــاردنەوەش دەخاتە پال خەمەکانی تری . بەبێ هیچ گومانێك ، ئەمەش یاسایەکی تری ئـەم چەرخەمانە . لەگەل ئەوەشدا کـە هیچ مانایـەکی تێدا نیە کە سەبارەت بە پێرەوگی مێژوو بێ .

( دیستۆیڤسکی ) ، ( تیۆچیف )ی ( شاعیری رووسیای ۱۸۰۳ – ۱۸۷۳ ) داناوە بە تواناتر لـە ( نیکراســـۆف ) ، بەلام ، لەگەل ئەوەشدا ، ( نیکراسۆف )ی داناوە بە میراتگری راستەقینەی ( بۆشکین )و ( لیرمونتۆف ) ، کەچی لە ( مێژووی ئەدەبی رووسی )دا پلەیەکی زۆر بەرزتری لە پلەی ( تیۆچیف )ی بۆ دانـاوە . پێـوانـەی داهێنـانی هونەری بە پێوانەی بەهرە دیاری ناکرێ . بێگومان پەیوەندییەکی راســـتەوخۆ لەمەدا هەیە . هەموو بەهرەیەکی گەورە دەگەرێ مەســـەلەیەکی گـەورە بۆ خۆی دەدۆزێتەوە . بەتایبەتی هەر لەبەر ئـەم هۆیەشە کـە ئەو بەهرەیە بـە بەهرەیەکی گـەورە دادەنرێ .

بەلام هەموو ئەو بەهرە گەورانەی کە وەکـو یەك وەهان یەك جۆرە ئەنجامی داهێنان پێشکەش ناکەن . تەنانەت جاری وا هەیە بەهرەی گەورە ، یـاخـود بلیمەتی ، لـەنیوەی رێگادا دەمـرێ . هەموومان کارەساتی ( گۆگۆل ) دەزانین . بۆیـە مەسەلەی رێباز هەمیشە وەك مەســـەلەیەکی تیژ دەمێنێتەوە . بەشێوەیەکی لاتەریك ســـەبارەت بە هونەرمەندێکی راســـتەقینە . ئەمـە تەنهـا گیروگرفتی پێشخســـتنی شارەزایی نیە . بەلکو مەسەلەی گەرانە بەدوای راستیو داهێنانی تازەدا. حوکمی ئێمەش دەبەسترێتەوە بە هونەرمەندەکەو ، بە حوکمی ئەو هونەرمەندە لەســـەر خەلکیو خستنە روویان .

جاری وا هەیە هونەر بە بیرو مێشـــکی مـرۆڤ دادەنێن . ئـەگـەر چی ئەمـەش زۆر تەواونیە . چونکە بیرو مێشك جاری وا هـەیـە ( ســـلبی )یە . تەنانەت هونەرمەندانی رابوردووی دێرین ، بۆ نموونە تراژیدییە کۆنـەکانی یۆنان ، لەبینینی دوا رۆژمـان پـارمـەتیمان دەدەن . بێ ئەوەی کاریان گوێزاندنەوەی ( ئەغریقی )یـانـەی زەمانی رابوردوو بێ .

نووســـەر مرۆڤ دەخاتە روو . شتی تازەتر لە مرۆڤدا دە دۆزێتەوە . لەســەر بناغەی ئـەم دۆزینەوەیەش نرخ بۆ شێوازی هونەری دادەنرێ مەزنترین داهێنـــانی هـونـەری ، لـەچـەرخی ناوەراستەوە تاکو ئیمرۆ ، لە زۆر لایەنەوە ، بـە رێبازی ریالیزمییەوە بەســـتراوە . ریالیزمیش تونایی بە خۆی ناهێنێ ، چونکە توانایی مرۆڤایەتی نایێت .

ریالیزم لێکۆلینـەوەی هونـەریی پێرەوگی رووحیو مێژوویی مرۆڤـایـەتییە . ئـەمـەش ،

بێگومان ، تەواوترین سیستمی لێکۆڵینەوەیە کە تاکو ئێستا هەیە . هونەرمەندی ڕیالیزمی بەشوێن هەندێ ڕێگادا دەگەڕێ بۆ ئەوەی واقیع لەناوەوەی ( واقیع ) خۆیدا بگۆڕێو چاکی بکاتەوە .... بۆیە ، وەك بناغەیەك ، هونەرمەندی ڕیالیزمی هەستێکی تیژی مێژووناسی‌ی هەیە . لە سەدەی نۆزدەهەمدا لەلایەن هونەری ڕیالیزمییەوە ، قووڵبوونەوەیەکی بەردەوام هەبوو لەناو ڕێبازی مێژوویيدا . لەپاڵ ئەوەوە بواری بایەخدان

بەگیروگرفتەکانی یاسای مێژووی بەرەوپێشەوە چوونی مرۆڤایەتی لەلایەن ڕیالیزمەوە زیاتر فراوان دەبووەوە .

لێرەدا ڕیالیزمی ڕووسی پلەی یەکەمی گرتۆتەوە . هەموو پێشکەوتنی ئەدەبی ڕووسی لەسەدەی نۆزدەهەمدا لە ژێر ئاڵای لەیەك نزیك‌بوونەوەی مەسەلە ئەدەبییەکانو مەسەلە شۆڕشییەکاندا بوو .

لەلای ( تۆلستۆی )و ( دیستۆیڤسکی )دا دەتوانین پتر لە کەموکوڕییەك لە دانانی سنوور بۆ هەندێ مەسەلەی فەلسەفی-مێژوویی بەدی‌بکەین . تەنانەت ئەو کەموکوڕیانەش کە باڵیان بەسەر سیستمە هونەرییەکانیشدا کێشاوە . پاڵەوانەکانی ( تۆلستۆی )و ( دیستۆیڤسکی ) ، لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازییە جەوهەرییانەی کە لە نێوانیاندا هەیەو ، لە ڕێگەی پێشکەوتنە ڕووحییەکانیانەوە ، خراونەتە بەردەم تێگەیشتن لە هەموو ئاڵۆزییەکی نا مەعقولی‌ی یاسای بەرەوپێشەوە چوونی مێژووی مرۆڤایەتی‌داو لە هەموو چەشنە زانستییەکدا کە بۆ وەدیهێنانی عەدالەت لە ناو پەیوەندییە مرۆڤایەتی‌یەکاندا دانراوەو بەشێکی زۆری لە شێوازی ڕەوشتو دەروونی مرۆڤایەتی لەگەڵ قۆناغەکانی مێژوودا دروستبوون . کەواتە لەم باری سەرنجەوە دەبێ بووترێ ئەدەبی ڕووسی تاکو ئێستا بە شێوەیەکی ڕاستەقینە لەم بارەیەوە نەکۆڵراوەتەوە . پێویست ناکات بووترێ بایەخدانی ( تۆلستۆی )و ( دیستۆیڤسکی ) بە چارەنووسی مرۆڤایەتی ڕێگر نەبووە . بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا هاندەرێك بووە بۆ پێشکەوتنی ئەو هۆیە هونەرییانەی کە تاکو ئێستاش نموونەیەکی باڵان بۆ لاسایی کردنەوەیەکی بەردەوام لە هەموو ئەدەبی جیهاندا . هەروەها ئەم بایەخپێدانە لە هەمان کاتدا ، نموونەیەکی ڕەسەنی بێ‌هاوتا بووە .

هەموو شارەزایەکی هونەری پەرەپێدانی مەحاڵ دەبێ ئەگەر ئەرکی دەربڕینی ژیانی ئاڵۆزی مرۆڤ نەخرێتە ئەستۆی نووسەر . بێگومان پاڵەوانەکانی ( تۆلستۆی ) یاخود ( دیستۆیڤسکی ) نموونەی ئاڵۆزترینو قووڵترین شێوەی مرۆڤایەتین . تەنانەت لەگەڵ پێرەوگی هەموو مێژووی ئەدەبی جیهانیدا . پاڵەوانەکانی تۆلستۆی‌و دیستۆیڤسکی لەگەڵ ئەوەی کە پاڵەوانن ، کەسانێکن کەسایەتییەکەشیان تەنها شتێکە بگاتە ڕادەی سەربەخۆییەکی موتڵەق . کەسانێکن ، یان تینوێتی هەموو مێژوویی مرۆڤایەتی لەخۆیاندا کۆدەکەنەوە ، بۆ ئەوەی بگەن بە ( کەمال ) ( وەك پاڵەوانەکانی تۆلستۆی ) . یاخود زۆرجار بەشێوەیەکی ( سلبی ) ئەزموونی مرۆڤایەتی وەردەگرن ، بێ ئەوەی چاکترینو بەرزترین ئامانجی مرۆڤ ڕەت بکەنەوە ، وەك ( پاڵەوانەکانی دیستۆیڤسکی ) .

ئەدەبی سۆشیالیستی ، لە ڕێبازی ڕیالیزمی ڕەخنەسازی - بەوە شێوەی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خودی مرۆڤایەتی‌دا وەرگرتووە . بەو سیفەتەی کە ڕێبازی ڕیالیزمی ڕەخنەسازی لە لێکۆڵینەوەو دەرخستنی دژایەتییەکانی ناو گیانی مرۆڤایەتی قووڵ دەبێتەوە. بەڵام ڕێبازی ڕیالیزمی سۆشیالیستی قۆناغێکی تازەتر کە بەرەوپێشەوە چوونی هونەری مرۆڤایەتی تۆمار دەکات .

( گۆرکی ) زۆر قەرزار باری ( تۆلستۆی ) بووە . بۆ نموونە پاڵەوانەکانی ( گۆرکی ) وەك پاڵەوانەکانی ( تۆلستۆی ) لە پێشکەوتنێکی بەردەوامدانو لە بڵندبوونەوەیەکی ڕووحی‌و ئەخلاقیدان . هەر پاڵەوانێکیش لە پاڵەوانە هەڵکەوتووەکانی ( گۆرکی ) ، ( سلبی ) بێ یاخود ( ئیجابی ) هەست بە پەیوەندییەکی توندوتیژی نێوان چارەنووسە کەسایەتییەکانیانو چارەنووسە مێژووییەکانیان دەکەن . ئەمەش بەهەمان ڕادە بەسەر ( پاڤل فلاسۆف ) و ( کلیم سامگین )دا دەسەپێ .

( پاڤل ) مێژوو دروست دەکات ، چونکە شۆڕشگێڕێکی ڕووسییە . تەواو دەزانێ کە

بەمێژووی جیهانییەوە بەستراوەتەوە ، چونکە ئەو ئایدیال نموونەیەی کـە هەیەتی لـەم موعادەلەیەدا کۆدەبێتەوە : « دەبێ ڕووسیا ببێت بە گەورەترین وڵاتی دیموکراتی . بەڵام ( کلیم سامگین ) پیاوی کارکردن نیە . بەڵکو تەنها تێڕوانەرێکە . لەگـەڵ ئەوەشدا بەرەو مێژوو دەڕوات . چونکە زۆر باش دەزانێ مێژوو خەڵکی دروستی دەکەن‌و چارەنووسی کەسایەتی ئەویش بەستراوە بەو چۆنێتییەی کـە ئەو خەڵکە مێژووی پێدروستدەکەن . بۆیە بەتاو خۆی دەهاوێتە ئامێزی بەسەرهاتەکانەوە . هـەر جارێکیش دەبێت بەگـالتەچی‌و دامـاو ، چونـکە هەوڵدانی بۆ کارکردنەسەر ڕێڕەوی بەسەرهـاتـە جیهانییەکان لەگەڵ تواناکانیدا ــ توانا کەسایەتییە رووخاوەکانیدا ، ڕێکناکەوێ .

ئەو ئەدەبەی کەوا مێژوو خۆی دروسـتی کردبێ ، خۆی لە خۆیدا هێزێکی مێژوویی مەزنە . چەندە ئەم ئەدەبە لـەنـاو مێژوودا قووڵ ببێتەوەو ئاسۆکانی بپشکنێ ، ئەوەندەش لەبزووتنەوەکەیدا مەزنتر دەبێت‌و دەوری خۆی دەبینێ .

بەهـەر حاڵ ئێمە نابێ خاسـیـیەتەکانی ئێسـتای وڵاتی ڕۆژاوای سـەرمایەداریمان بیربچێتەوە . نووسەری ڕۆژاوا ناچارکراوە لەگەڵ چەشـنە جماوەرێکدا رەفتـان بکات کـە زۆر بێهێزبێ‌و هیچ باوەڕێکی بەخۆی نەمابێ‌و هـەموو هیوای بە دواڕۆژی خۆی ونکردبێ . بێگومان ئەو جەماوەرەش بەشێکە لە خەڵکی جیهانی ڕۆژاوا کە ئێسـتاکە بەزاراوەیەکی ( باو ) پێی دەووترێ : ( نامۆبوون ) .

فیشـەر لە کتێبەکەیدا کە ( ئەدەب‌و گیـانی سەردەم )ە ، پێناسـەی وشەی نامۆبوون دەکات‌و دەڵێ : « **نـامۆبوون حـالـەتێکە بیـرکـردنـەوەی ( سلبی )و نـەمـانی پەیوەندی‌و ونبوون‌و تەنیایی تیادا زاڵ دەبێ** » ، لەکاتێکیشدا کە هەسـت دەکەیت « **لەبەردەم کۆمەڵێ شتی تەنک‌و بەرگێکی بێمەرج‌و قەوارەو ڕستەدا وەستاوی ... ڕەنگە بەقووڵی هەست بەنامۆبوون بکەیت ، لە جیهانێکی سەرمایەداریدا نە لە دواقۆناغدا بێ . ئەم هەست کردنە ــ « کات بەفیڕۆدانە »** » ــ بووە بە مەڵبەندی ئەدەبێك کە جەوهەرەکەی ورەبەردان‌و ترس بێت بەرامبەر بە ئەنجامی پێشکەوتنی سەرمایەداری ، یاخود ونکردنی بڕوا بە دۆزینەوەی دەروازەیەك بۆ ڕزگاربوون ، یاخود ئاراسـتەکردنی ڕەخنەی ڕاستەوخۆو و ناڕاستەوخۆ ، بەڵام بەبێ لـەنـاو بردنی لەناوچوو ــ نفي النفي ــ » .

. کـەواتـە ، تیئۆری « ڕیالیزمێکی بێکەنـار ــ واقعية بلا ضفاف ــ » ، دەبێتە مەسـەلەیەکی ڕابوردوو . هەڵبەت بەرزبوونەوە بۆ ( لەنـاوبردنی لەناوچوو ) لەم سەردەمەماندا تەنها لەتوانای ئەو هونەرمەندانەیە کـە باوەڕیان بـە شۆڕشـی سـۆشیالیستیانە هەبێ‌و لە هەڵوێستەکانیاندا خۆیان بگرن .

لەناوبردنی لەناوچوو تێپەڕکردنی حـالـەتی نامۆیی ناگەیێنێ . بەڵکو بەرگریکردنە لە ئایدیالی سـۆشیالیستی ڕاسـتەقینەو بەجێهێنانێتی . بەرزبوونەوە بۆ ڕادەی لەناوبردنی لـەنـاوچـوو مەسەلەیەکی گرانە . گرانە بەڵام پێویسـتە . چاکترین هـونـەرمەنـدانی جیهـانیش لـە ئەزموونەکانیاندا ئەمە دەسەلمێنن .

ئـەگـەر ( کامـۆ ) وەربگریـن ، دەبینین ، مەسـەلەی نامۆبوون دەخاتـە پێش هەموو مەسەلەیەکیترەوە بۆیە کارە ( مەنهەجی ) یەکەی خۆیشی ناوناوە : « نامۆ » . نامۆ سـەبارەت بەجیهان‌و ، سەبارەت بە هەموو خەڵکی‌و تەنانەت بە خۆیشی .

« شەو ( ماریا ) هات‌و لێیپرسیم ئایا حـەز بە خوازبێنیکردنی دەکەم یاخود نەء ؟ . لە وەڵامدا پێم وت بەلای منەوە خوازبێنی کردنی‌و خوازبێنی نەکردنی یەك شتن ، بـەڵام ئەگـەر خۆی دەیەوێ شووم پێبکات ئەوا من دەیخوازم ، هـەر وەك هەموو جارێکی تر وەڵامم دەدایەوە ، ئەم جارەش وەڵامم دایەوە ، ئەم کارە زۆر گران نیە ، بـەڵام ، بێگومان ، من حەزناکەم . لـەبـەر ئـەوە ئەویش لێی پرسـیم : « ئەی کـەواتـە بۆچی دەتەوێ بمخوازی ؟ » منیش وەڵامم دایەوە ، کـە ئـەمـە گرنگ نیە : « ئەگەر ئەو حـەز دەکات من دەتوانم بیخوازم » .

بەسـەرهاتەکانی ئـەو « نامۆ »یە لـە ( جەزائیر )ی وڵاتیدا « نامۆ » دەبێ . ( میرسۆ ) کـە مووچەخۆرێکی بچووکی فەرەنسـیە .

بەدەمانچە پیاوێکی عەرەب دەکوژێ ، بەلام خۆیشی تێناگات کە ئەو کارە چۆن ڕوودەدات ، بەرێکەوتی دەزانێ . تاوانباری سەرەکی هەتاوی گەرمی ئەفەریقایە ، دەبێ بەهۆی ئەوەی ( میرسۆ ) هێزی ئەوەی تێدا نەمێنێ خۆی ڕاگرێو ئەو کارە نەکات . وای بەخەیالدا چوو بوو کە پیاوە عەرەبەکە لەو کاتەی لەسەر لی گەرمی کەناری دەریادا ڕاکشابوو هەلساوەتە سەرپێو بەچەقۆیەکەوە پەلاماری ئەمی داوە بیکوژێ . بۆیە ( میرسۆ )ش بۆ بەرگری کردن لە گیانی خۆی ڕووی دەمانچەکەی کردۆتە پیاوە عەرەبەکەو کوشتوویەتی . هە[redacted]حەقیقەتەکە . بەلای ( میرسۆ ) وە نەمەبووە . بێ ئەوەی بڕیاری لەمەوپێشی دابێ ، ئەو تاوانەی کردووە . لەهەمان کاتیشدا هیچ ( هۆیەك ) نەبووە بەهۆی ئەو تاوان کردنەی . چ مرۆڤێك بکوژێو چ نەیکوژێ ـ ئایا هەر یەك شت ناگەیێنێ ؟ خۆ ( میرسۆ ) دەیتوانی لە بەلای سزا خۆی دوور بخاتەوە . بەلام ئەوەی نەکرد .. کەواتە چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان سزادانیو سزانەدانی‌دا ؟ .. ئەنجام .. ( میرسۆ ) هەر تاوانبار کرا .

لەناو بەندیخانەدا دانیشتووە . ئەوەی بیری لێبکاتەوە تەنها ئەم مەسەلەیەیە : هەروەکو دادپەروەر ڕایگەیاند ، « مەسەلەکەم بەپێی پێویست دەوری خۆی بینی » .

جاروبار گوێم بۆ قسە شلدەکرد ، مەسەلەکە تادەهات زیاتر درێژەی دەکیشاو گەورەتر دەبووەوە ، منیش لەهەناسە سارد هەلکێشاندا بووم . بەلام لەو هەموو ماوەیەدا کەسێك نەبوو لێم تووڕە ببێ ، هەموو شتەکان ئاسایی بوون ، مەسەلەکە بەرێکوپێکی ئەمسەرو ئەو سەری پێدەکرا ، هەستم دەکرد کە : « منیش ئەندامێکی ئەم خێزانەم ... » . چاوەڕێی ئەوەبووم پیاسەیەکی ڕۆژانەی ناو حەوشەی بەندیخانەکە بکەم ، یاخود پارێزەرەکەم سەرێکم لێبدات . زۆر کاتیش بیرم لەوە دەکردەوە : « گەر زۆریشم لێبکرێ لە کلۆرە درەختێکدا بژیمو تەنها لەوێوە ئاسمان بەدیبکەم ، ڕەنگە لەوێش مەسەلەکە ڕاهاتن بێ ، منیش تیایدا ڕابێم » .

وەچەکانی ( میرسۆ ) یەکەمیان ( ڕۆکانتان )ی ناو ( هێلنج )ی ( سارتەر )ە . ( ڕۆکانتان ) مرۆڤێکە کە هەرگیز گوێ بەخۆی نادات . کەسێکە هەست بەخۆی ناکات . « کە دەلێم ئێستا ( من ) .. ئەم ( من )ە بەلامەوە هیچ شتێك ناگەیێنێ . وەهام لێهاتووە هیچ هەست بەخۆم نەکەم ، چونکە ئەوەندە لەبیرچوومەتەوە . ئەوەی وەك ( واقیع ) تیامدا مابێتەوە ، تەنها ئەوەیە وەك گیانلەبەرێك هەست بەبوونی خۆم دەکەم . زۆرو لەسەرخۆ باوشك دەدەم . من ( کەس ) نیم ، ( ئەنتوان ڕۆکانتان ) سەبارەت بەهیچ گیانلەبەرێك بوونی نیە » .

بەلای ( ئەلبێرتۆ مۆرافیا ) شەوە دەتوانرێ لە ڕووی ئەم دیاردە شازەی کەبێی دەووترێ ـ نامۆ بوون یاخود بێزاربوون ـ دەربخرێ : « لەم ڕووەوە ، بێزاربوون نامۆبوونە ، یاخود ئەنجامی ڕووخانی ئەو مرۆڤەیە کە لە باری ( مەبەست )ەوە دەگۆڕێ بۆ باری ( هۆ ) . مرۆڤ ، لەناوماندا ، زۆرجار هەست بەوە دەکات کە خاوەنی خۆی نیە،هەروەکو فرۆشرابێ بە هێزێکی شاراوەو نەناسراو . مرۆڤ حەقیقەتی ئەوە نازانێ ، کە هەمیشە ئامانجەکەی بەشێوەیەکی زۆر تایبەتی مرۆڤ خۆیەتی ، بۆیە هەست بەخۆی دەکات کە ( نامۆ )یەو دەکەوێتە ناو بێزارییەوە » .

نامۆ بوون کارەساتە ، کارەساتیش چەندەها جۆرە .. خەلکیش بەرامبەر بەکارەساتێك هەر یەکە لەلایەکەوە باری سەرنجی خۆی دەردەبڕێ .

( سارتەر )یش . لە ڕۆمانی ( هێلنج )دا مرۆڤێکمان پیشاندەدات کە ئازارەکەی نەك تەنها بەهۆی بارو زرووفی مەوزووعییەوەبێ ، بەلکو بەهۆی هەستکردنێتیی‌بەو بوونی ( من )ی تایبەتی‌ی خۆی .

بەلام ( مۆرافیا ) ، لەوە تێپەڕ دەبێ ، هۆیەکانی نامۆبوونو بایەخ نەدان بە ژیانو تەنانەت بە ( خود )یش دەخاتە ڕوو . پالەوانی ڕۆمانەکەیشی کە بەناونیشانی ( بێزاری )یە باسی وەچەیەکی تەواو دەکات ، کە لەژێر ئالای ( فاشستییەت )دا پەروەردەبوون . هەر ئەو ئالایەش بوو بە هۆی خوێن ڕژانی . بەلام کارەساتی ڕاستەقینە تەنانەت لەمەشدا نیە .

چونکە کارەسات بەبێ بوونی خەبات پێی ناوترێ کارەسات ، نەبوونی خەباتیش لەبەر ئەوە نیە باوەڕ بە مرۆڤو بەخود نەبێ ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە بێزارییەك تەنانەت بە پێشێلکردنیشـــــــت دەر نابڕی .

« کامۆ » مەســــەلەکە دەگەیێنێتە حاڵەتی ( کارەساتی‌کردار ) پاڵەوانەکەی ، لەســەرەتادا ، گوێ بەهیچ شـــتێك نادات ، پاشان دەکەوێتە دژایەتییەکەوە لەگەڵ بیروباوەرەکانی ئەو جیهانەی کە تیایدا دەژی . ئیتر نیشانەکانی یاخی‌بوونەکەی ( میرسۆ ) لەبەردەم دادگادا دەردەکەوێ . بەلام یاخی‌بوونی ڕاستی لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە ( قەشەکە ) دەچێ بۆ لایو خۆی بۆ ئامادە دەکات کە نوێژی بۆ بکات .

**« کاتێك شتێك لە ناخمدا تەقییەوە ، نەمزانی بۆچی چەتوون بووم . جنێوم دایێو داوام لێکرد کە نوێژم بۆ نەکات . دەستم لەیەخەی گیرکردو . هەرچییەکم لەدڵدا بوو بە ئارەزوو و قینەوە پێم وت ... باوەڕم بەخۆم هەیە ، باوەڕم بە هەموو شتەکان هەیەو لەویش زیاتر باوەڕم پێی‌هەن ، باوەڕم بەژیانی خۆمو بەو مردنەی خۆشم هەیە کە چاوەڕوانم دەکات ... » .**

یاخی بوونی ( میرسۆ ) یاخی بوونێکی نـاو ( بۆشایی )یە ، بەلام بەبێ مانا نیە ، چونکە ئەوەی لەناوەوەی ( میرسۆ )دایە مرۆڤە . ( رشـــانەوە ) هەنگاو نانێکی دیکەیە لە پێرەوگی نەدەبی « کامۆ »دا ، پاڵەوانەکەی ( رشـــــــانەوە ) بۆ خزمەتکردنی خەڵکی خۆی تەرخان‌دەکات . لەهەمان کاتدا باوەڕی بەوە هەیە کە پێویســـت ناکات ئەو خزمەتە بکات .

« کامۆ » مرۆڤیکمان پێ‌دەناسێنی ، ڕەنگە ئێستا کە لە خەو هەڵسابێ بۆ کارکردن . یاخود بەڕاستی خۆی خستبێتە ناو کارێکی ئازایانەوە . کە چی لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە دژی بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی خۆیەتی .

یەکەم لە « نـامـۆ »دا دەرکەوتووە ، دووهەمیشیان لە « رشانەوە »دا. ( میرســـۆ ) بەهۆی کوشتنی مرۆڤێکەوە هەست بە نابەجێیی ناکات ، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە کە بۆی دەرکەوتووە کە خۆی مرۆڤێکی تەواو نیە . ئەوەی زیاتر ئاشکرابێ ، « کامۆ » بەهۆی کارتێکردنی ( تاوانو سزا ) کەی ( دیستویڤسکی )یەوە ( نامۆ ) کەی نووسیوە . بەلام لەگەڵ ئەوەشـــدا ئەو جیاوازییە گەورەیەی لە نێوان ( ڕاسکۆلنیکۆف )و (میرسۆ)دا هەیە ، ئەوەیەکە ( ڕاسکۆلنیکۆف ) کاتێ تەورەکەی کێشاوە بەسەر پیرێژنە سووخۆرەکەدا ، بیری لە ڕزگارکردنی جیهان کردۆتەوە . بەلام ( میرســـۆ ) ئەو کاتەی پیاوە عەرەبە بێتاوانەکەی کوشتووە ، لە بنەڕەتەوە بیری لەهیچ نەکردۆتەوە . موعاناتی ( میرسۆ ) لە ئەزموونی موعاناتی ( ڕاسکۆلنیکۆف ) هیچ کەمترێك نیە . بەلام دەربارەی مەسەلەی (هۆ) وە موعاناتی ( میرســــۆ ) جیاوازییەکی تەواوی لەگەڵ موعاناتی ( راسکۆلنیکۆف ) دا هەیە : ( هۆ ) یەکەش لە مەســـــەلەی کوشتنەکەدا نیە ، بەڵکو لە ڕاستی‌دا ( میرسۆ ) بە ماوەیەکی زۆر بەرلەوەی بیر لە کوشتن بکاتەوە ، لەوەدا نەماوە کە مرۆڤ بێ . بەلام ( راسکۆلنیکۆف ) بۆ ڕێگای ڕێکەوتن لەگەڵ مرۆڤایەتیدا دەگەڕێ . واتە ئەوەی بیری لێبکاتەوە چارەنووسی مرۆڤایەتییە لە کاتێکدا کە ( میرسۆ ) سەوداسەری ڕزگارکردنی مرۆڤایەتییە. کەچی خۆیشی پێویستی بە کەسێك هەیە ڕەنگی مرۆڤایەتی‌ی بخاتەوڕوو . لە « رشـــــانەوە »دا گیروگرفتەکە جۆرێکی ترە . دکتۆر ( رینێ ) ئەویش سەبارەت بە هەموو خەڵکی نامۆیە، تەنانەت بە ( خودی ) خویش ، ئەمەش باوەڕی پتەوی ئەوە . بەلام ژیان لە هەموو جۆرە باوەڕێك بەهێزترە . باوەڕ خۆی لەخۆیدا تێڕوانێکی یەکبوونییە . بەلام ژیان ، خەڵکی‌و جەماوەرە ، هەموو مرۆڤایەتییە . بۆیە هەچ باوەڕێك ئەگەر لە خزمەتی بەرژەوەندیی خەڵکیدا نەبێ ژیان لەناوی دەبات .

دکتۆر ( رینێ ) وەك کەسێکی ( وجوودی ) کە باوەڕی بە بێهودەیی ژیان هەبێ ، خەبات‌کردن دژی لەناوبردنی نەخۆشیی رشـــانەوە بە کارێکی بێ‌مانا دادەنێ . بەلام لەبەر ئەوەی کە پزیشکە ، دەبێت بە ڕابەری ئەو خەبات گێڕانەو پێویستیشی کردووە لەگەڵ خەڵکەکەدا وەك مرۆڤێكو وەك پزیشکێکیش هەست بە لێپرسینەوە بکات .

خەڵکەکە رشانەوە لەناو دەبەنو دەکەونە بەختەوەرییەوە ، بەلام دکتۆر ( رینێ ) ئەو خەڵکە

هەر بە ساویلکە دەزانێ ، چونکە نازانن رشانەوە لە هەچ ساتێکدا بێدەشێ دووبارە بگەڕێتەوە ناو ئەو خەڵکە .

دکتۆر ( رینێ ) لە بیروڕاکانی خۆی نەکەوت ، واتە هەر وەکو جارانی خۆی مایەوە ، لەهەمان کاتدا ئێستاکە مەسەلەیەکی بەشدار و خەڵکەی دەبەستێتەوە ، ئەو مەسەلە بەشدارەش سەرکەوتنە بەسەر کارەساتی گشتیدا . مەسەلەی بەرزی هەموو ئەدەبی ئەم سەردەمەمان مەسەلەی ( ئیلتیزامە ) . « کامۆ » تاڕادەیەکی ئێکجار زۆر لێی نزیك دەبێتەوە . بەڵکو ڕاستەوخۆش دەیخاتە بەرچاو . بەڵام [illegible]بینین هەڵوێستەکەی ( ئیزدواجییانەیە ) . تەنها هونەری ڕیالیزمیشە کە بتوانێ مەسەلەی ئەم سەردەمەمان ـ کە مەسەلەی ( ئیلتیزامە ) ـ بخاتە ئەستۆی خۆی .

ئەو ڕێگایەی بەرەو ڕیالیزم دەڕوات مۆرکی هیچ کەسێکی پێوەنییە . کامۆ ، کە وجوودیەکی خاوەن باوەڕە ، هەستی بە پەیوەندیەکی بتەو کردووە لەگەڵ ڕیالیزمییە مەزنەکاندا . بەبێ باوەڕنەهێنان بە مرۆڤ هونەرمەند ئەو زەمینەیە ون دەکات کە لە سەری ڕادەوەستێ کەچی وجوودیەت فەلسەفەی ( ناباوەڕە ) . وجوودیەت خاوەنی مێژوویەکی دوورو درێژە . بەڵام لە ئیمڕۆماندا فەلسەفەی وجوودی لایەنێکی ئەدەبیی تەواوی گرتۆتەوە .

ئەم سەردەمەمان مەزنی‌و توانایی‌و دەسەڵاتداری تەواوی مرۆڤی خستۆتە ڕوو ، مرۆڤیش لەبەردەم ئەم مەزنی‌و توانایی‌و دەسەڵاتداریەدا سڵی کردۆتەوە ، هەستی کردووە، بەرامبەر بەو هێزانەی کە خۆی لە سروشتدا دۆزیونێتیەوە دەستە ئەژنۆ دەستاوە . ئەگەرچی ڕاست نیە بڵاوبوونەوەی وجوودیەت بە مەسەلەی دۆزینەوەو داهێنانی بەرزی زانستی ئەم چەرخەمان لێك بدرێتەوە . چونکە مەسەلەکە مەسەلەی تەکنیك نیە ، بەڵکو مەسەلەی بینا کۆمەڵایەتییەکەیە .

دەربڕینی بێ توانایی مرۆڤ لە بەرهەمی ئەو نووسەرە ڕۆژئاواییانەدا دەردەکەوێ ، کە بەگشتی هەڵوێستی ڕیالیستی‌و دیموکراتییانەیان هەیە . بۆ نموونە ( هاینریش بیول ) . لە کتێبەکەیدا کە بە ناوی ( تا ئێستا لە ئەنتیکەخانەدا جێگای بەتاڵ نیە )یە . بە ڕوونو ئاشکرا بایەخ بەو کەسانە دەدات کە لە ( گیانو ڕەوشتدا ) زیانیان لێ کەوتووە .

لەسەر ئەم بناغەیەوە هەندێك لە نووسەرانمان بڕیاری ئەوە دەدەن کە ( بیول )و ( کافکا ) لەیەکەوە نزیکن . بەڵام ئەمە ڕاست نیە . چونکە ( هاینریش ) پاڵەوانەکانی خۆی دەخاتە ناو هەڵوێستێکەوە کە تیایدا بەرەوڕووی ئەو تاوانە دڕندایەتییانەی ئەڵمانیای ( نازیەت ) بینەوە کە بەرامبەر بە مرۆڤایەتی کرا ، هەروەها بەرەوڕووی لێپرسینەوەی تایبەتی هەموو مرۆڤێکی ئەڵمانی بینەوە. هونەر کەبیبەوێ مرۆڤ وەك (ئێچێریك)ی ناو مێژوو پیشان بدات ، بێگومان بەپێچەوانەی تەبیعەتی تایبەتی خۆی دەوەستێتەوە . بابەتی سەرەکی مۆدەرنیزمیش وێناندنی بێدەسەڵاتی‌و بێتوانایی مرۆڤە ، بەرامبەر بەهێزە ناڕەواکانی سەردەم . داهێنانە بنەڕەتییەکانی بەهرەوەرانی هونەرمەندانی مودەرنیزمیش لێرەدایە . هەر لێرەشدا کەم توانایی لە داهێنانەکانیاندا دەردەکەوێ .

( ولیێم فۆلکنەر ) لەکاتی وەرگرتنی خەڵاتی « نۆبل »دا وتویەتی : (( **مەسەلەی لەناوچوونی مرۆڤ ڕەتدەکەمەوە** )) . هەروەها وتویەتی : **زۆر گران نیە ، بووترێ مرۆڤ نەمرە ، لەبەر ئەوەی بەئاسانی ، لەسەر ڕووی ئەم زەمینە ون نابێ ، تەنانەت ئەگەر بشمێنێ بەبێ دوا لێدانی زەنگی زەمانە لەناو تاقە بەردێکدا کە بەبێ مەبەست لەسووریی خۆرئاوادا هەڵدراسراوە ، تەنانەت لەو کاتەشدا گوێی لە چرپەیەکی بێهێزی ئەو دەنگی مرۆڤایەتییە دەبێ کە هەرگیز کپ نابێ ، بەڵام من ئەوەش ڕەتدەکەمەوە . من باوەڕم بەوەیە کە مرۆڤ تەنها بە خۆ بەدەستەوە نەدان قاییل نابێ ، بەڵکو ئاهەنگیش بۆ سەرکەوتنی خۆی دەگێڕێ . نەمرییەکەی بۆ ئەوە نیە لەناو هەموو گیانلەبەراندا تەنها دەنگێك بێ کە کپ نەبێ ، بەڵکو بۆ ئەوەیە گیانی توانایی هەیە بەسەر موعاناتو خۆبەخت کردنو ئارامگرتندا . بۆیە مافی ئەوەمان پێدراوە لەکاتی یارمەتیدانمان بۆ مرۆڤ لە ڕێگای سەختی بەرەو نەمریدا ، پیاوەتی‌و شەرەفمەندایەتی‌و هیواو**

ئازارو ئەندێشەو بەزەیی‌و خۆبەخت‌کردنو سەربەرزی ڕابوردووی مرۆڤمان بیربێنەوە » .

من لەو بڕوایەدام ( بیول ) قسەکەی ( فۆلکنەر )ی ڕەت نەکردۆتەوە ، بەلام هەموو ئەدەبێکی نەتەوایەتی ئەرکی یەکلایی‌و گشتی‌و ڕێگای تایبەتی‌ی خۆی هەیە . بۆیە « مرۆڤ »ی ئەمری ( فۆلکنەر ) لەو کەسانەی ( بیۆل ) نیە کە لەناخی خۆیاندا لێپرسینەوەیەکیان بەرامبەر بە ئەلمانیا هەلگرتووە ، ئەگەر چی ئەو دووکەسەش سەر بەسەردەمێك بن .

( فۆلکنەر ) نووسەرێکی گەورەیە . جاری وەها هەیە لەلایەن تواناو یەکەمی‌ی بەهرەدا بە ( شۆلۆخوف ) بەراورد دەکرێ . لەڕاستی‌دا شتێك لە هەردووکیاندا هەیە . بەلام ئەو کەسانەی ( فۆلکنەر )و ( گریگۆری میلخۆف ) دیاری زیاتر پێ‌هەلدەگرن ، لێکچوونی نێوان پالەوانی ( فۆلکنەر )و ( گریگۆری میلخۆف ) دیاری دەکەن . هەردووکیان ، هەروەکو دەیلێن ، ون‌بوونەو خۆشیان نازانن چیان دەوێ . بەلام بەکەم . ( گریگۆری میلخۆف ) بەوڕێکا ڕاستییەدا نەڕۆیشتووە کە لەبەردەمیدا بووە . دووەم ، ( شۆلۆخۆف ) گەورەترین نوێنەری ( ڕیالیزمی سۆشیالیستی )یەو ڕیالیزمییەکەش وێنەی ژیان بە هەموو ئاسۆ شۆڕشگێڕێتیکەیەوە دەکێشێ . بەلام لەلایەکی ترەوە مەسەلەکە تەواو بەپێچەوانەی پالەوانەکەی فۆلکنەرو فۆلکنەر خۆیەوەیە .

( ئەرنست فیشەر ) ( فۆلکنەر ) بە نووسەرێکی ڕەخنەگر دادەنێ « کە حەزناکات ( واقیعی دیاری‌کراو ) وەکو خۆی وەربگرێ واتە ، بۆ ئەوەی جیهانی ئەو پەیوەندی‌و نەریتو شتە باوانەی کە هەن بیانتەقێنێتەوە ، بۆ ئەوەی بچێتە بنج‌و بناوانی شتەکانەوە ، حالەتە نارێکەکان هەلدەبژێرێ‌و ئەو شتە نموونەییانە دیاری‌دەکات کە پێویستن ... چەقۆ بەری شارستانییەت دەبرێ فیچقە دەکات ، خوێنێکی خەستی سەرشێت . ئەوەی وێنەی بگیرێ شتە نا عەقلانییەکانی ناو یاسانو ، ئەو سۆزە نامەعقول‌و شێواوانەن کە شێتانە زیاد دەکەنو ، ئەو ڕاچەنینانەن کە لە ئەندێشەوە هەلدەقولێن » .

ئەم قسەیە زۆر بەوردی کراوە ، بەلام هەموو شتێکی نەوتووە . ( فۆلکنەر ) بووە بە ڕیالیزمی ، بەلام نەیتوانیوە لێپچڕانی تەواوی لەگەل ( مۆدەرنیزم )دا ئاشکرا بکات .

بە موناسەبەتی گیروگرفتی مۆدەرنیزمیشەوە ڕۆمانی ( دکتۆر فاوستۆس )ی ( تۆماس مان )م بیردەکەوێتەوە . پالەوانی ڕۆمانەکە مۆسیقارێکە توانیویەتی مۆسیقا بگۆڕێ بۆ چەند جۆرێك لە جوولانەوەی‌شێوەی دەنگ . هیچی تری پێ‌نەماوە کە بیدات بە خەلکی . خەلکی ئیتر پێویستییان پێ‌ی نەماوەو ئەویش ئەوەی ... دەرکەوتووە . ئەوە بووە بە کۆتایی هونەر... کۆتایی هونەرو کۆتایی مرۆڤ . هەموو هونەری ڕابوردووی سڕیوەتەوە ، تەنانەت سیمفونیایی نۆیەمی ( بیتهۆڤن )یش . هونەرمەند بووە بە ( موهەرجێك ) بەخۆی نەبێ بەکەس‌تر پێناکەنێ .

ئەو هونەرەی کە لە خەلکی جیابێتەوە دەبێتە هۆی گالتەپێکردنێك بە هونەرمەند خۆی .

(ستراخۆف ) جارێکیان لە سالی ١٨٧٦ دا ، بەبۆنەی گەڕانەوەی لە ( یاسنایا پولینا )و چاوپێکەوتنی لەگەل ( تۆلستۆی )دا کە پێنج سال بوو ناسیبووی ، نووسیویەتی‌و دەلێ : « لە یاسنایا پولینادا ، ئەشێ هەموو کارەساتێکی مرۆڤایەتی ڕوو بدات ، تەنها یەکێك نەبێ . ئەویش ئەوەیە کە هەرگیز لەوێدا هەست بەبێزاری ناکات ، چونکە تەوەری ئەم جیهانە مرۆڤێکە هێشتا گیانی بەردەوام لە گەورەبوونەوەدایە » .

( ڕۆزانۆف ) هەروەها بەبۆنەی یادی ستراخۆف‌و دوایین پەیوەندی‌ی بە ( تۆلستۆی )یەوە لە وتارێکی‌دا نووسیویەتی‌و دەلێ : « ئەو شتەقوول‌و تاریکانەیی تیادا خۆشەویست کە کەس نەیبینیونو ، لەو شتانەش کە تاکو ئێستا لە ناخییەوە هەلدەقولێن .. » . بۆچوونەکەی (ستراخۆف) دەربارەی ( دیستۆیفسکی ) لە بۆچوونەکەی دەربارەی ( تۆلستۆی ) کەمتر نەبووە . ئەگەر چیش شێوەیەکی جیاوازی هەیە .

« کە یادی دەکەمەوە ، ئەوەی دەخاتە سەر سوڕمانەوە ، جولانەوەی ئەو عەقلە

**ئاشكرایەو ئەو گیانە بە بەهاتو هەمیشـــەییەتی هـەر وەكـو جارێ هیچ شـــتێكی تێدا كاكڵـە نەبووبێت . تا ئەم ڕادەیە هەســـتو بیرەكانی گەورەتر دەبوون ، تـا ئەم ڕادەیەش لەناخیـــدا هەندێك شتی شاراوە هەبوون كە تا ئێســــتا نەبوتوون ... » .**

هەر نووسەرێكی هەڵكەوتوو . لـە سەدەی بیستەمدا هیچ مانایەكی نابێ ئەگـەر لەدەرەوەی نـەریتـە ئەدەبییەكانی ( تۆلســـتۆی ) یاخـود ( دیستویڤسكی )دا بێ .

بەڵام [illegible] ناگەیێنێ كـــە لەبەردەم سەدەی بیستەمدا لە دووبارە كردنەوەی بەرهەمی سەدەكانی پێشوو بەولاوە هیچی تر نەبێ . تاكو ئێســــــتا دەوبارەی داهێنانی ناو بەرهەمی نووسەرانی ڕۆژئاوایی ســـەدەی بیستەمی وەك ( ڕۆمان ڕۆلانو تۆماس مانو برۆســـــتو همنگوایو فۆلكنەرو كامۆو كافكا ) شتی زۆر كەم وتراوە . بەڵام داهێنانە هونەرییەكانیان ، تەنانەت بـەناوبـانگترینیـان ، نـاگـەنـە داهێنـانەكـانی ( تۆلستۆی ) یاخود ( دیستویڤسكی ) ، هەموو لە ژێر كـارتێكردنی ڕاســــــتەوخۆی ئـەو دوو نووسەرەدان .

( گۆركی ) دانەری ڕیالیزمی سۆشیالیستییە لـە پێشخستنی ڕیالیزمی سـۆشیالیستیشدا ، ئازایەتی بۆ ( شـــۆلۆخۆف ) دەگەڕێتەوە . بۆ یـەكـەمین جـار مێژووی ئەدەبی جیهـانیـدا ، ( شـــۆلۆخۆف ) جولیارێكی ئاسایی كردووە بـە پاڵەوانێكی سەرەكی ناو چیرۆكێكی داســـتانیی بەرز ، یان ڕۆمانێكی بلیمەتانە . ئەمە ڕووداوێكی بێ هـاوتـایـە ــ بەدەستهێنانێكی بەرزی هەموو پێشـــــكەوتنێكی ئەدەبی جیهانییە . « دۆنی لەســــەرخۆ » مەزنترین قۆناغـە لـە مێژووی ڕیـالیزمـدا . تەنهـا هونـەرمـەندێكی ڕیالیزمی توانیویەتی چیرۆكێكی ڕاستەقینەی وەها دابهێنێ كە پڕبێ لە بابەتی كاریگەر سەبارەت بە كودەتایەكی مەزن لە ژیانی وڵاتێكی پانو بەریندا ...

ئەم چیرۆكە تەنانەت لەوە دەچێ گێڕانەوەی مێژوویی بێو بە بیرێكی فەلســـەفی قووڵەوە دانرابێ ، لەبەر ئەوەی هەندێ مەسەلەی بنەڕەتی دەخاتە ڕوو كـە بـە ڕێگای ژیانی مرۆڤایەتییەوە بەســـترابێتەوە . ئێمە كە « الدون الهادیء » دەخوێنینەوە ، هەر وەكو ئەوە وایـە چیرۆكێكی واقیعیو دانپیانانی كەسێك بێ كە بەچاوی خۆی ڕووداوەكانی بینیبێت .

ڕیالیزمی ( شـــــۆلۆخۆف ) لە ڕیالیزمی ( تۆلســـتۆی ) نزیك دەبێتەوە . هەموو ئـەو نووســەرانەی دەســـــتیان بۆ چارەنووســـە مێژووییەكـانی مرۆڤو گـــەلان بردووە ، لـــە ( لیف تۆلستۆی )یەوە فێربوون . دەتوانین باسی ڕوجیـە مارتین دۆگارا ( خێزانی تیبۆ ) بكەین . هـەروەهـا همنگوای ( زەنگەكان بۆكێ لێدەدرێن ــ لمن تقرع الاجراس ــ ) . ئـەم چـەرخـەمـان چـەرخی دوو جەنگی جیهـانییە كە جیهانیـــان هێناوەتە لەرزین چەرخی ئەو شەڕی ئازادیخوازو نیشتمانییانەن كە لە چەند كیشـــــــوەرێكدا هەڵگیرسان ، شەڕی كودە تای شـــۆرشدارو بنیاتنانی سۆشیالیستی لە زۆر وڵاتاندا .

بەشداركردنی هۆشـــیارانەی گەلانیش لـە بەســــــبەرهاتو ڕووداوە مێژووییەكاندا بوو بەكاركردنێكی باش سەبارەت بە پێرەوكی مێژوو . ڕیالیزم لەم سەدەیەماندا ســـــەركەوتنی مەزنی بەدەســـت هێنا ... مەبەســـتم لـە ڕیالیزم بەشێوەیەكی گشتییە ، نەك بە تەنها ڕیـالیزمی ســـۆشـیالیستی . ڕیالیزمی سـۆشیالیستی بـە شــــێوەیەكی تـەواو ئـەو ڕیالیزمەیـە كـــە بەســــــتراوە بـە نۆدترین بیروباوەڕی پێشكەوتووخوازانەو تاقیكردنەوەی كۆمەڵایـەتی . بۆیە تەنها لەبەر ئەم هۆیە ئـەم ڕیالیزمە دەتوانێ بـــە شێوەیەكی پتەوتر گیروگرفتی گشتیی ئەم چەرخەمان بخاتەڕوو .

لەم كاتەماندا بەرهەمی زۆر بە شـــێوەیەكی هەمەلایەن هێنرایەدی . هەموو ئەم بەرهەمانەش ســــــوودیان لـە « جەنگو ئاشتی »یەكەی ( تۆلستۆی )یەوە وەرگرتووە . كاتێ كە ڕووخاندنی فاشستییەتیش بۆ هەموو كەس ئاشـــكرا بوو ، چەندین نووسـەر ئەم پرسیارەیان خـــستەڕوو : لە چ وڵاتێكداو لەلایـەن چ نووســــەرێكەوە « جەنگو ئاشتی »یەكی تازەتر دەنووسرێتەوە ؟!

ئەم پرسیارە لەوە دەچێ هیچ مانـایەکی ئەوتۆی تێدا نەبێ ، بەلاَم ، لەگەڵ ئەوەشدا ، لەخۆڕایی نەکراوە . چونکە ئەم هەموو ڕووداوو بەسەرهاتە مەزنانەی کـــە لەم چەرخەماندا هەیە . هەڵبەت پێویـــستی بە هونەرێکی داســــتانی ( ملحمی ) هەیە .

داستان گەلە . داســــتان تابلۆی ژیانە ، دیاری کردنی لایەنە باشەکانی ژیانە تەنانەت ئەگەر لە لێژییەکی تراژیدیشدابێ . داستان سەرکەوتنی ژیانە بەسەر هەموو شتێکدا کە لێی نامۆبێ .. داستان وێنەی سەرکەوتنی ژیان پیشان‌دەدات ، یاخود ســــەرکەوتنی گەل ، چونکە ژیـان ئـەو گەلـەیـە ـ کە بەڕاستی هەموو هاوکێشـــــەو پێوانەکانی هەلگرتووە .

مەسەلەی گەل گیروگرفتی ســــەرەکیی داستانە . بەلاَم گیروگرفتێکی ئاســـانیش نیە ، بەڵکو ڕەنگە ئاڵۆزترین گیروگرفتە کە هونەرمەندی ڕیالیزمیی هاوچەرخ تووشی‌بێت .

گەل بەلای ( لیف تۆلستۆی )یەوە ... گەل بـەلای ( همنگوای )یـــەوە ... گـــەل بـەلای ( شۆلۆخۆف )ەوە ... سێ هونەرمەندی جیاوازو سێ چارەسەری جیاواز بۆ گیروگرفتی گەل ... تەنها شتێك کە هەرسێکیان تیایدا بەشداری‌بکەن ئەوەیە کـە هـەریـەکـەیـان پالەوانەکەی خۆی بەپێوانەی گەل پێوانەدەکات . دەربارەی گەل لـە بەرهەمەکانی ( تۆلســــتۆی )دا ، بەتایبەت لە ڕۆمانی « جەنگ‌و ئاشتی »دا ژمارەیەکی زۆر لـە وتار نووسراوە . چەندەها کتێبیش بۆ ئەم باســە تەرخان‌کراوە . بەلاَم من ناڵێم لەم مەســـەلەیەدا بەئاشـــــکرا بوونێکی تەواو گەیشـــــتووین . ( تۆلستۆی ) گەلی بە شـێوەیەکی گشـــــتی وەرگرتووە ، لـە دەرەوەی جووڵانەوەدا . گـەل وەکو خۆی مەزنە . وەك ئەو شــێوەیەی کـــە هەیەتی ، پێوانەیە بۆ هەموو شتێك . مانای ژیان لەناو ژیان خۆیدا دەبینێتەوە ، لەژێر دەســـتی ئەو پالەوانەدایە ئەو پالـەوانـە تەنانەت ئەگـەر هەژارو چەوساوەش بێ ، لەگەڵ ئەوەشــــدا ، سەربەرزە . چونکە دانایە ، لەزۆر کاتـدا ، زۆر چاك تێدەکات کە ژیان بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە بنیات‌کراوە . من دەڵێم « بە زۆری » لەبەرئەوەی بەدەگمەن لەم بارەیەوە ئەوەی لە ناخیدایەتی دەری دەبڕێت . بەلاَم پالەوانی ( تۆلســــتۆی ) دەزانێ میللـەت چی دەوێ‌و ، بێـزاریی خـۆی لـەچی دەردەبڕێ ، پالەوانەکەی ( تۆلستۆی ) دەزانێ لە ئاستی میللەتدا تاوانی چیە . کارەســــاتیش لەمەدایە . لەبەردەم میللەتدا دەیەوێ پاکـانە بۆ خۆی بکات . ئەوەندە بـاسی هیـواو ئاواتەکـانی پالەوانی ( تۆلستۆی ) ڕەکەن تا دەبێت بەمرۆڤێکی (شتێکی) ئاسایی . بەلاَم ئەوە سیفەتێکی سەرەکی نیە کە تیایدا هەیە . ئەگینا [illegible]ایە ، زۆر بە خێرایی دەیتوانی ئامانجی خۆی بەدی‌بهێنێ . ئامانجە ڕاستەقینەکەی زۆر ئاڵۆزترو گەورەترە . مەسەلە سەرەکییەکەش لە گەڕان بەدوای ڕاستیدا لەناو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکاندا کۆ دەبێتەوە . جەوهـــەری ڕیـالیزمی داســــتانی بـــەلای ( تۆلستۆی )یەوە لەمەدایە .

لە ڕۆمانی « زەنگەکان بۆکێ لێدەدرێن » دا « همنـگوای » دووبـارە پـالـەوانەکەی خـۆی بـەرەورووی میللەت کردۆتـەوە . ( همنگوای ) ( تۆلستۆی )ی زۆر خۆشەویـســت . بەتایبەتی چیرۆکەکەی کە بەناوی « قۆزاق »ە . پالەوانی ( همنگوای ) ... هەڵوەشــــاوەتەوە بەهـۆی ئاوەژوو بوونەوەی ناخی خۆی . وەك مرۆڤێـکی جەربەزەش ، لە شێوەی پالەوانی ( تۆلستۆی )دا لە میللەت نزیك دەبێتەوەو بە تەواویی خووڕەوشتی میللیانە بەخێلی دەبات .

بـەلاَم ئـەوەنـدەی لەناو میللەتـدا داوای پالپشـــــتو یارمەتیدەر دەکات ئەوەندە داوای ڕزگاربوونی تیا ناکات . لەمەدا جیاوازییەکی زۆر گـــەورە دەبینین لەنێوان پالـــەوانی ( همنگوای )و پالەوانی ( تۆلستۆی )دا .. پالەوانی ( تۆلستۆی ) لە ناو میللەتدا بەتایبەت بۆ ڕزگاربوون دەگەڕێ . بەلاَم ( همنگوای ) بەجۆرێکی تر تەماشـــــای میللەت دەکات .

هەروەهـا پـالـەوانی ( همنگوای ) کـــە چارەنووســـی خۆی بەچارەنووســـی میللەتەوە دەبەستێتەوە ، هەرگیز بەوکارە لەمەودوای نێوان خـۆی‌و میللەت کورت نـاکـاتـەوە . ( ئەندرێ

بۆلکۆنسکی )و ( بیێر بیزوخۆف )یش تێکەڵ بەمیللەت نابن . ئەمە ڕاستە ، بەڵام لەلایەنی ئەوەوە کە پێویستیان بەخۆیان هەیە ، بەردەوام بە خۆیاندا دەچنەوە ، بۆ ئەوەی لەبەرچاوی میللەت بە سەربەستی خۆیان بگەن . پاڵەوانی ( همنگوای ) هەرگیز بەم شێوەیە بیرناکاتەوە . بەڵکو پێویستی بەسەلماندنێك هەیە ، بەرێگای بەشداریکردنی لە مەسەلەیەکی میللەتدا ، بۆئەوەی لەبەردەم هیچ جۆرە تاقیکردنەوەیەکدا پاشگەز نەبێتەوە .

« زەنگەکان بۆ کێ لێدەدرێن » . کە ڕۆمانێکی بەرزە دەربارەی پاڵەوانێتیو چالاکی ئاکاری مرۆڤایەتی ، ئەوەی سەلماندووە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕۆمانە داستان نیە . هۆیەکەشی ناگەڕێتەوە بۆ کەوتنی گەلی ئیسپانی لە خەباتکردن ، دژی فاشستییەت بەڵکو کەوتنی ئێستای ڕێگایەك دەبێ بۆ سەرکەوتنی دواڕۆژی. ( همنگوای ) مردنی پاڵەوانەکەی داوەتێ نە ڕووخانی هەموو ئاواتەکانی . پاڵەوانەکە بەردەوام‌بوو لە تێگەیشتنی ئامانجی ژیان کە ئامانجێکی تەنها ژیانی کەسایەتییە ، ئاشکرایە کە هەموو ژیانێکی کەسایەتی ، هەرچۆنێك بێ ، هەر دەبێ بگاتە کۆتاییەکەی . « زەنگەکان بێ کێ لێدەدرێن » ڕۆمانێکە دەربارەی پاڵەوانێتیو تراژیدیای مرۆڤێك لە پێناوی مەسەلەی گەلدا خەباتی کردبێ ، بەڵام نەبووە بە بەشێکی ئەو گەلە .

لەلایەکی ترەوە « دۆنی لەسەرخۆ » ڕۆمانێکە دەربارەی مێژوو و ، گەلو مرۆڤایەتی ، لەگەڵ ئەوەی ( گریگۆری میلخۆف ) بایەخ پێدانەکەی کەمتر نەبووە لەو بایەخەی کە همنگوای لە « زەنگەکان بۆکێ لێدەدرێن »دا بە پاڵەوانەکەی داوە کە ( ڕۆبەرت جۆردان )ە لەهەمان کاتدا ( شۆلۆخۆف ) ڕۆمانەکەی خۆی بۆ پەیوەندی نێوان مرۆڤو مێژوو تەرخان کردووە .

لە پاڵەوانەکەی ( شۆلۆخۆف )دا هەندێ سیفەت هەیە کە لەهەمان‌کاتدا لە پاڵەوانەکەی ( تۆلستۆی )یشدا هەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا ( شۆلۆخۆف ) لەبارەی جوتیارێکی ساکاری نیمچە نەخوێندەوار نووسیویەتیو ( همنگوای )یش ، وەکو ( تۆلستۆی ) ، مرۆڤێکی خاوەن ڕۆشنبیرییەکی بەرزی پێشکەش‌کردووە . ڕیالیزمی ( شۆلۆخۆف ) جۆرێکی‌ترە . ئەوەی بەتایبەتی جێی سەرنج بێ ( لەوەدەچێ ڕەخنەگران ئەمەیان ڕەچاو نەکردبێ ) ئەمەیە : پاڵەوانی تراژیدیی ( تۆلستۆی ) خۆی لەگەڵ نزیك دەکاتەوە ، هەر بەپێچەوانەشەوە ، پاڵەوانی تراژیدی ( شۆلۆخۆف ) لەگەڵ دوور دەکەوێتەوە. مەبەستم لە ( گریگۆری میلخۆف )ە وەك تەوەرێکی فیکریو هونەری ناو ڕۆمانی « دۆنی لەسەرخۆ ».

کارەساتی پاڵەوانی ( تۆلستۆی ) لەوەدایە کە ناتوانێ لە میللەت نزیك ببێتەوە .

بەڵام کارەساتی پاڵەوانی ( شۆلۆخۆف ) جۆرێکی‌ترە . ( گریگۆری میلخۆف ) کەسێکی ناو میللەتە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانیوە خۆی بخاتە ڕیزی گەلەوە . بێگومان ئەمەش کارەساتیکی بێ‌هاوتایەو لەڕووی پێوانەوە یەکێکە لەو کارەساتە مەزنانەی کەوا ئەدەبی جیهانی پیشانیان دەدات . ( گریگۆری میلخۆف ) کەسێك نیە کە سەر بە میللەتی خەباتگێڕ نەبێ ، بەڵکو تەنانەت ئەو کەسەشە کە میللەت دژێتی .. کە چی لەگەڵ ئەوەشدا کارەساتی ئەم پاڵەوانە لەمەدا نیە . چونکە ئەگەر بچێتە ڕیزی سپییەکانەوە ، ئەوا ئەو کاتە کارەساتەکەی نابێت بەکارەسات . لەم جۆرە حاڵەتانە زۆر هەن ، تەنانەت ڕەنگە حاڵەتی نموونەییش بن . بەڵام ئەوەی بەسەر ( گریگۆری میلخۆف )دا هاتووە ، هەرگیز نموونەیی نەبووە . پاڵەوانێکی نانموونەیی بووە بە پاڵەوانێکی نموونەیی . بەشێوەیەکی گشتیش ، بەدەگمەن پاڵەوانی تراژیدی دەبێت بە پاڵەوانێکی نموونەیی .. ڕاڕایی لەنێوان بەرەیەکو بەرەیەکی تردا ئەوە دەردەخات کە هێزێکی شاراوە لەناو شاکارە داستانییەکانی شۆڕش‌و قووڵاییەکی شاراوە لە ناو کارەساتە تراژیدییەکاندا هەیە .

ئەو پاڵەوانەی کە نووسەرەکە بەشێوەیەکی واقیعیانە دەریخستووە ، هەمیشە لەبەردەم

هەڵبژاردنی ڕێگایەکدا ڕادەوەستێ ، هەڵبەت ئەم کارەش داوای لێدەکات کە مەردایەتیو پیاوەتییەکی تەواو بنوێنێ . یاخود لەبەردەم هەڵبژاردنی هۆکانی بەرگری کردنی لەو هەڵوێستانەی کە هەڵیبژاردوون ڕادەوەستێ ، ئەم کارەش هەروەها داوای مەردایەتیو پیاوەتی لێدەکات . هەموو واتایەکی ئێستاتیکی — پەروەردەیی نموونەی هونەریش لەمەدایە .

چارەنووسی پاڵەوانی ئەدەبی بەگوناهەکەیو بەپاکییەکەی دیاری ناکرێ . چونکە ئەم جۆرە سیفاتانە ڕەنگە لای مرۆڤێکیشدا هەبێ ڕەنگی نەبێو بریتی نەبێ لەهیچ شتێك .

پاڵەوانی ئەدەبی بە هێزی دەگمەنی کەسایەتییەکەی خۆی ، دەبێت بەجێی بایەخ پێدانو لە بیری ئەوەکاندا جێی خۆی دەکاتەوە ... پاڵەوانی ئەدەبی ، هەروەها بەدەستنیشان کردنی گیروگرفتەکانی سەردەمو بە پێداویستەکانی بەرامبەر بەخۆیو بەخەڵکی ، دەبێت بەجێی سەرنجی ئێمەو لە بیرو مێشکی نەوەکاندا دەمێنێتەوە .

( گریگۆری میلخۆف ) توانیویەتی لەمێشکی نەوەکاندا جێگای خۆی بکاتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا گوناهی گەورەی کردووە ، گوناهی کردووە ، بەڵام دەروونی پیس نەبووە . گوناهەکەی لەکاتێکدا کردووە کە بەدوای ( ڕاستی )دا گەڕاوە . یاخود سزای تەواوی خۆی داوە . واتە لەگەڵ ئەوەی گوناهبارە ، شەهیدیشە . هەمیشە برینەکانی خۆیمان بۆ دەخاتەڕوو . تووشی ئازارمان دەکات. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئاگامان لە هەموو ئەو گوناهانەیەتی کەدەیکات . تەنانەت لە تاوانەکانیشی.

لەبەرچاویا مێژوو دروست دەکرێ ، ئەویش جگە لەوەی بینەرێکیئەو دروستکردنەیە ، بەشداریکی گرنگی ناو کارەساتو ڕووداوەکانە.. مرۆڤێکە هەموو ڕێگاکانی ناو مێژوو لەناو گیانیدا بوون بە دوو ڕێیان . سەرلێشێوانیو ئازارەکانی ڕاستەوخۆ بە زرووفی دژایەتی نێوان سپییەکانو سوورەکانەوە بەستراوەتەوە . پاڵەوانێك لە پاڵەوانەکانی ( دیستۆیڤسکی ) کاتێك کە ویستوویەتی پێناسەیەك بۆ جوانی دابنێت ، وتویەتی : « لێرەدا خواوەندو ئەهریمەن دەکەونە ململانێ ، بەڵام گۆڕەپانی ئەو ململانێیە لەناو دڵی خەڵکیدایە » .

پاڵەوانەکەی ( دیستۆیڤسکی ) ، لەیەك کاتدا خواوەندیشەو ئەهریمەنیشە . واتە ئەوەندی باوەڕی بە بڕوای بەرز هەیە ، ئەوەندەش نکۆڵی لێدەکات . هەچ ڕووبەڕوو بونەوەیەکیش لە ئازادا هەبێ دەستەپاچە دەبێ . لەم بۆچوونەوە دەتوانین بڵێین پاڵەوانەکەی ( شۆلۆخۆف ) لەناو هەمان بارو زرووفی پاڵەوانی ([illegible]ۆیڤسکی)دایە لە نێوان دوو سەربازگای دژ بەیەکدا ئەمسەرو ئەو سەر دەکات . لە ئەنجامی ئەوەدا ، بەئاشکرا تابلۆیەکی هەمەلایەنی ئەو خەباتە مەزنە دەردەکەوێ ، کە چارەنووسی گەلێکی گەورەی تیادا دیاری دەکرێو هەموو بەرەوپێشەوە چوونێکی داهاتووی مێژووی پێوە دەبەسترێ . بەشێوەیەکی گشتی ، هەموو ڕیالیزمێك لەنێو کاری هەڵبژاردنی ڕێگایەکی ژیانەوەو بەرهەڵستی کردن لەو ڕێگایە وێنەی مرۆڤ دەکێشێ . ڕیالیزمی سۆشیالیستیش ، هەر وا دەکا .

هونەرمەندی ڕیالیزمی سۆشیالیستی بەدەستهێنانی باشترین ئایدیال نموونەی مرۆڤایەتیو یاسای پتەوی مێژوو دەخاتە پێشچاو .

ئەنجامی ئەوەش ، ئەو لێپرسینەوانەی کە خراونەتە ئەستۆی هونەرمەندو ئەو کەسانەی کە هونەرمەند وێنەیان دەکێشێ زۆرتر دەبن . ( گریگۆری میلخۆف ) دەبوایە بەرامبەر بەگەڵ وەڵامی هەڵسوکەوتەکانی خۆی بدایەتەوە ، بەڵام ( ئەندرێ بۆلکۆنسکیو ئیڤان کارامازۆف ) بەرامبەر بە ویژدانی خۆیان وەڵامی هەڵوێستەکانی خۆیان دەدایەوە .

ئێمە خۆمان ژیانی خۆمان پێکدەهێنین ، هەموو کەسێکیش لە ئێمە لێپرسراوە بەرامبەر بەو کارەی کە دەیکاتو کە چۆن دەبێ بیکات . من بەلای خۆمەوە بەڕاستی نازانم ، ئەدەبەکەمان دابەشکەین بۆ ئەدەبی ( جۆش سەندن ) .

هەروەها لە ئیمڕۆماندا نرخاندنی نووسەر

به خستنەڕووی ژیان به شێوەیەکی ڕاستی‌و قووڵی پێوانە دەکرێ . ئەم کارەش ئەوە دەگەیێنێ کە ئەم پێوانەیە ، پێوانەی لێپرسینەوەیە بەرامبەر بەتێکڕای مەسەلەکەمان .

لەم دواییەدا ڕەخنە لەلای ئێمە دەستی بۆ گەورەیی لێپرسینەوەی نووسەر بردووە . ئەو کارەش بووە بەهۆی بەرەپێدانی شێوازی سۆزاوی بەکارهێنانی باسی ژیانی خودی نووسەر لەناو ئەدەبدا .

واتە نووسەر دەبێت بە پالەوانێکی ناو بەرهەمێکی ئەدەبی ئەوەی باشتر لە موعاناتی مرۆڤی سۆڤیاتی ئیمڕۆ تێبگات . هەروەها بەشدار بێت لە لێپرسینەوە بەرامبەر بە بەرهەمەکەی ـ ئەوەی کە دایهێناوەو ئەوەی کە دایشی نەهێنێ ـ .

**چەندین کتێبی تازە لەچاپدراوە ، کە بەسترابن بە مێژووی پێشکەوتنی کۆمەڵگای سۆڤیاتییەوە لە هەموو قۆناغێکی بنیات کردنیدا .**

لەم کتێبانە ، دوو چیرۆکی ( نیلین ) کە یەکێکیان بەناوی « دڵرەقی »یەوە ئەوەی تریشیان بەناوی ماوەی تاقیکردنەوەیە . هەروەها چیرۆکێکی ( ئۆلگا بیرگۆلتس ) کە بە ناوی ئەستێرەکانی ڕۆژ و داستانەکەی ( تفاردونسکی )و چەندەهای تریش .

لە ئەدەبی ئەم ساڵانەی دواییەدا لایەنی شیکردنەوە زیاتر پەرەی سەند . شیکردنەوەش بەرەو سۆزایەتی واتە دانپیانان ڕێی گرتەبەر .

**( ئۆلگا بیرگولتس ) کە باسی ژیانی خۆی دەکات ، وەکو ئەوە وایە باسی مێژووی وڵاتەکەی خۆی بکات . ئەدەبی سۆڤیاتی ئەدەبی بیروباوەڕو کرداری مەزنە . ئەدەبێکە زۆرترین لایەنی گەشبینییە . بەڵام لە هەمان کاتیشدا ، زۆرترین بابەتی تراژیدیایە . لە قۆناغە تایبەتییەکانی بەرەوپێشچوونیدا ، هەندگاوەکانی لەو ڕۆژەوە نران کە مێژووی مرۆڤایەتی لەباری لێژی‌و گۆڕاندابوو . لەم بارەشدا لێپرسینەوەی کەسایەتی تاڕادەیەکی زۆر پەرەی‌سەند . ڕەنگە هەموو ئەو بەرهەمانەی کە نووسەرە سۆڤیاتییەکان لە بیستەکاندا دایانهێناوە ، لەلایەن بابەتەوە تراژیدی بن‌و لەلایەن چارەسەرکردنیشەوە گەشبین بن . بۆ نموونە « هەرەس »ی ( ڤادییێف )و « چابایێف »ی « گورمانۆف »و « لێشاوی ئاسنین »ی ( سیرا فیموڤیچ ) .**

ئەدەب ، تاکو ئێستا ، بەم هێزە کۆمەڵایەتی ـ مێژووییەوە بەرامبەر بە مرۆڤ نە وەستاوەتەوە ، هەروەها ، تاکو ئێستا ئەو توانایەی بە مرۆڤ نەداوە بۆ ئەوەی لەو دژایەتییەدا سەربکەوێ . ئەو ئەدەبەمان کە بەئاشکرا لە خزمەتی جەنگی مەزنی نیشتمانیدایە . ئەزموونی ئەدەبی بیستەکانی دووبارە کردۆتەوە . کە لەبابەت جەنگی ناوخۆیی‌یەوە نووسراوەتەوە . جارێکی‌تریش وەکو ئەو ڕۆژانەی پێشوو ، نووسینەکانی ( لیف تۆلستۆی ) بایەخێکی گەورەیان پێدرایەوە . ئەگەر باسی نووسەرەکانی خۆمان بکەم گرانە بە لامەوە نووسەرێك ببینم لە بابەت جەنگەوە نەینووسیبێ . لەبەر ئەوە بە تەنها ناوی یەك ڕۆمان دەهێنم ئەویش « تەمووزی ساڵی ١٩٤١ »ی ( باکلانۆف )ە . لایەنە باش‌و خراپ‌و کەموکورییەکانیش دەخەمە ئەولاوە . بەڵام ئەوەی لێرەدا بەلامەوە گرنگێ ، ڕێبازی ( باکلانۆف )ە ، سەبارەت بە دیاریکردنی لێپرسینەوەی مرۆڤ بەرامبەر بە مرۆڤ‌و مێژوو. هەروەها توانایەکانی لە کارکردنەسەر ڕێڕەوی ڕووداوو بەسەرهاتەکان . وەك بۆم دەرکەوتووە ، ( باکلانۆف ) توانیویەتی بکات بەهەندێ ئەنجامی بنەڕەتی . ڕەنگە ئەو کارەش بوو بێت بە هۆی باشگەز بوونەوەی لە هەنگاوەکانی پێشووی . بۆ ئەمەش نموونەیەك دێمنەوە ، ئەویش دیمەنێکە، تیایدا جەماوەرێکی قین هەڵگرتووی هەڵچوو مامۆستایەك ڕاودەنێن ، کە بەوە تاوانبارکراوە گوایە ئیشارەتی تایبەتی بۆ فڕۆکەکانی ئەڵمانیا ناردووە .

مامۆستای بێتاوانیش ، دەکەوێتە سەر تەنانی مردن ، بەڵام کوڕێکی بچووکی ئەو مامۆستایە ، پەلاماری ئەژنۆی ( شالایێف )ی ئەفسەر دەدات‌و گازێکی لێدەگرێ . لە ئەنجامی ئازاری ئەو گازە ئەفسەرەکە بە ئاگا دێتەوە ، پاشان جەماوەرکەش مەسەلەکەیان بۆ ئاشکرا دەبێت‌و تێدەگەن .

# دوو ئەستێرەی ورشەداری شیعری ڕۆمانی

چیا عومەر ساقی

**وەک سەرەتایێکی پێویست دەبێ باسێکی کورتی مێژووی ئەدەبی ڕۆمانی بکەم‌و ڕووناکی بخەمە سەر ئەو ڕێبازانەی پێ‌یدا تێ پەڕیوە .**

**سەرەتایی مێژووی ئەدەبی ڕۆمانی وەک ئەدەبی زۆربەی گەلانی جیهان بریتیە لە فۆلکلۆرە میللیەکان ، هەروەک نەتەوەی کوردیش کە چاووگی ئەدەب نووسینی بریتین لە هونەرە میللیەکانی کە وەک « لاوک‌و حەیران‌و چیرۆکی دیوەخان‌و ... هتد » بێ .**

**سەرەتای نووسینی ڕۆمانیش دەگەڕێتەوە بۆ سەر دەمی پاشای « وڵاتی ـ داک »[١] ، « بۆ ڕێبیستا »[٢] کە بریتیە لەو نووسراوە نەخش کراوانەی سەر بەردی خانوو بەرەکانی ئەو سەردەمە « ١٠٠ ساڵ پێش زایین » ، بەڵگەی مێژوویی تریش زۆرن لەمانە ئەو پارچە پەخشانەیە کە « ئۆڤیدیو » بە زمانی « گیتو ـ داک »[٤] نووسیویەتی .**

پاش داگیر کردنی وڵاتی « گیتو ـ داک » لە لایەن ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانەوە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانەوە وردە وردە زمانی ڕۆمانی پەیدا بووەو چۆتە ژێر باڵی زمانی لاتینیەوە لە سەرەتادا زمانی « داکۆ ـ ڕۆمان » پەیدا بووە ئەویش بریتی بووە لە زمانێکی لاتینی شکەست‌و تێکەڵ بە زمانی « گیتو ـ داک » لە ئەنجامی کار تێ‌کردنی ئەو نەتەوەو میللەتانەی بە خاکی ڕۆمانیادا تێ پەڕ بوون نەختە نەختە زمانی ڕۆمانی هاتۆتە کایەوە ، لەبەر ئەوە ئەتوانین بڵێین کە زمانی ڕۆمانی لقێکی خاوێنی زمانی لاتینی نیە .

پاش سەر هەڵدانی ئایینی « کریستیانی »و دروست بوونی وڵاتی « سلاڤۆ ـ بولگار »[٥] لە خوارووی ڕووباری « دانووب »دا ، پەیوەندی نێوان ئیمپراتۆریەتی ڕۆمان‌و وڵاتی « داکۆ ـ ڕۆمان » دەپچڕێ‌و ئەمەی دووایی دەکەوێتە ژێر تەوژمی زمانانی تری وەک « سلاڤی‌و هەنگاری »یەوە ، لەبەر ئەوە فۆرمە لاتینیەکەی دەشێوێ . ئەوە بوو زمانی « سلاڤۆنە » لە کاروباری میری بە تایبەتی بۆ نووسراوە ئایینیەکان بەکار دەهێنرا .

٭

بۆ یەکەم جار نووسینی ڕۆمانی بە شێوەی نوێ‌و بە پیتی لاتینی بەکار هێنرا ئەوەش لە ساڵی ( ١٥٢١ ) دابوو ، لەو ساشەوە تا ئەمڕۆ نووسینی ڕۆمانی ڕووخساری تایبەتی خۆی هەیە .

ئەدەبی ڕۆمانیش وەک ئەدەبی جیهانی بە گشتی‌و ئەدەبی ئەوروپایی بە تایبەتی بە ڕێبازە سەرەکییەکانی ئەدەبدا تێ پەڕبووە ، « کلاسیکیزم ، ڕۆمانتیزم ، ڕیالیزم‌و ڕیالیزمی سۆشیالیستی » جگە لەم ڕێبازە سەرەکیانەش تەوژمی ئەدەبی‌ی تری وەک « سیمبۆلیزم Symbolisme ، ناتووریزم Naturisme »[٦] لە ئەدەبی ڕۆمانی‌دا بە دی دەکرێن .

## ١ ـ کلاسیکیزم :

ئەم ڕێبازە لە کۆتایی سەدەی هەژدەمەوە تا سەرەتایی سەدەی نۆزدەهەم لە ئەدەبی ڕۆمانی‌دا بە دی دەکرێت . نووسەرو شاعیرەکانی ئەم ڕیبازەش زۆربەیان لە ژێر کاری ئەدیبە کۆنە لاتینیەکانی وەک « هۆمێر ، ڤیرگیلیو »[٧] دابوون .

## ٢ ـ ڕۆمانتیزم :

لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لە ئەدەبی ڕۆمانیدا بە دی دەکرێت‌و بەرزترین شاعیری ئەم ڕێبازە « میخایل ئێمینێسکو »یە .

**٢ - ڕیالیزم :**

ئەم ڕێبازەش لە کۆتایی سەدەی ڕابووردووەوە تا ئەمڕۆ بەردەوامەو دووای شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە تەواوی تەشەنەی کردووەو هێلێکی شۆڕشگێڕی لە ئەدەبی ڕۆمانیدا گرتووە .

لێرەدا دەبینین ڕێبازەکان درەنگ تر لە ئەدەبی ڕۆمانیدا ڕەنگیان داوەتەوە وەک لە ئەدەبی ولاتانی تری ئەورووپایی وەک « ئینگلستان و فەرەنسە » ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ولاتیکی [illegible]و زمانیکی سەر بەخۆی ڕۆمانی ، تا سەرەتای چەرخی ڕابووردوو کاتێک کە سێ پارچەکەی ڕۆمانیایەکیان گرت و ولاتی ڕۆمانیا سەرکردایەتی « ئەلێکساندەر یۆن کوزا » دامەزرا .

ئەم دوو شاعیرەی هەڵبژاردوون ، دوو نموونەی شیعری ڕۆمانتیکی و شیعری ڕیالیزمی ڕۆمانیین ، شاعیری یەکەم « **میخایل ئیمینیسکو** »یە . لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابووردوودا هاتۆتە دنیاوە ، ئەم شاعیرە بەرزو لێ هاتووەی ڕۆمانیا توانی لە ماوەیێکی زۆر کورت و کەم خایەندا بەرزترین پلەی ئەدەبی ڕۆمانی داگیر بکات و ناز ناوی « گەلاوێژی شیعری ڕۆمانی » وەربگرێ . شاعیر ژیانێکی زۆر ورشەداری نەبووە ، لە ڕۆژی ١٥/١/١٨٥٠ لە بەشی ژووروی ڕۆمانیادا هاتۆتە دنیاو لە ڕۆژی ١٥/٦/١٨٨٩ لە تەمەنی « ٣٩ » ساڵی دا گیانی بە خاک و نەتەوەی ڕۆمانی دەسپێرێ و « ئۆپێرایێکی » نێجگار فراوان جێ دێڵی بۆ گەلی ڕۆمانی ، بەشی زۆری نووسینەکانی بریتین لە شیعر هەروەها نووسینی ڕەخنەیی و درامای شیعری و تاکە ڕۆمانێک و پەخشان و نووسینی تری بابەتی ئەدەبی .

ئۆپێرای نووسراوی شاعیر نزیکەی ( ١٥٠٠٠ ) لاپەڕە دەبێ و بە بەرزترین شاعیری ڕۆمانی دادەنرێ ، ڕەخنەگرە ئەورووپیەکان دەیخەنە ڕیزی ڕۆمانتیکە بەرزەکانی ئەورووپای وەک « تیێک ، نۆڤالیس ، ژ . پ . ریخستەر ، ڤیکتۆر هوگۆ ، کیاتیس » .

لە ئۆپێدای ئەم شاعیرە بەرزە وەرگێڕاوە بۆ زمانانی تری وەک ( ئینگلیزی ١٩٣٠ ، ئەڵمانی ١٩٣٧ ، ڕووسی ١٩٤٠ ، فەرەنسی ١٩٥٨ ، ئیتالی ١٩٦٤ ، هەنگاری ١٩٦٧ ، پورتوگالی ١٩٧١ ) .

شاعیر خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە ڕۆمانیا تەواو دەکاو لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا دەچێتە « ڤیەننا » بۆ درێژە پێدانی خوێندن ، لە ساڵی ١٨٧٢ دا دەکەوێتە داوی ئەڤینی ( ڤێرۆنیکا ) نەوکیژە ڕۆمانیەی لە ( ڤیەننا ) دەیخوێندو هەر لەوێش لەگەڵ شاعیردا یەکیان ناسی ، لە هەمان ساڵدا دەگەڕێتەوە ولات و زۆربەی ژیانی بەنووسین و ڕۆژنامە گەریەوە دەباتە سەر ، لە تەمەنی (٣٣) ساڵی دا نەخۆشی‌یەکی سامناک سەری تێ دەکاو شەش ساڵ بە ئێش و ئازارەوە لە ناو جێ دەکەوێ تا ڕۆژی ١٥/٦/١٨٨٩ چاوی بۆ دووا جار لێک دەنێ و لە باوەشی خاکی ڕۆمانیادا خەوی لێ دەکەوێ و لە دەروونی گەلی ڕۆمانیشدا جێی هەتا هەتایی بۆ دەکرێتەوە . ئەوەی زانراوە دەربارەی خۆشەویستیەکەی ئەمو ( ڤێرۆنیکا ) کەوا بەردەوام بووە تا چەند ساڵێکی پێش مردنی ، بەڵام کاتێ کە شاعیر تووشی نەخۆشی ( نێرڤ - اعصاب ) دەبێ ڤێرۆنیکاش سارد دەبێتەوە لە خۆشەویستی‌یەکەی ، بەڵام ئەوەی شایەنی سەر سوڕمانە ئەوەیەکە ڤێرۆنیکاش لە هەمان ساڵدا کۆچ دەکا دووای کۆچی شاعیر بە چەند مانگێک و دەگاتە کاروانی ئەمری شاعیر دوو نموونەی شیعری « ئیمینێسکو »م وەرگێڕاوە هەرچەند لە ڕووی فۆرمەوە نەختێک دەستکاریم کردوون بەڵام لێکسو ناوەرۆکە کانیان پارێزراون .

**— نموونەی شیعرەکان —**

**پارچەی یەکەم**

**﴿ بە بەرزییەوە ﴾**

بە بەرزییەوە مانگ تێ دەپەڕێ
درەخت بە کپی دەلەرێتەوە
لە نێوان چڵی ئەرخەوانەکان
دارستانی مات دەزرنگێتەوە

* * *

زۆر لە دوورەوە زۆر لە دوورەوە
کز کز لە سەر خۆ ، هەروا لە سەر خۆ
گیانی پەرۆشی بێ لایەم
شیرین تر دەبێ بە بۆی مەرگەوە

★ ★ ★

بۆ بێ دەنگ دەبی ، کە ئەفسوناوی
دڵم ڕووەو تۆ ڕوو وەردەگێڕێ
بە سۆز تر بگری ، شمشاڵی شیرین
بۆ منی شەیدا ، تۆش هەر بە جارێ

★ ★ ★

**پارچەی دووەم**

**﴿ تەنها یەک خۆزگەم ماوە ﴾**

تەنها یەک خۆزگەم ماوە
لە بێ دەنگی ئێوارانـدا
لێم گەڕێن بۆ خۆم بمرم
لە کەناری دەریاکاندا
خەوێکی خامۆشم بێو
دارستانم لە پاڵ بێ
بە سەر ئاوی کشاودا
ئاسمانەکەم ساماڵ بێ
نەکفنی ئاڵم دەوێو
نەبۆم هەڵبەستن مەزار
پێخەفێکم بۆ بچنن
لە چڵێ ناسکی دار

ئەم پارچە شیعرە بریتییە لە پێنج کۆپلەو تەنها دوو کۆپلەی وەرگێڕراوە .

**شاعیری دووەمیش ، ( لوکیان بلاگا )یە ..**

شاعیری فەیلەسوفی ڕۆمانی لە ١٨٩٥/٥/٩ هاتۆتە دنیاوە هەر لە ڕۆمانیا ( کۆلێجی زانستە کریستانیەکان ) تەواو دەکاو لە ( ڤیەنا ) دوکتۆرا وەردەگرێو تاکە شاعیری ڕۆمانیە کە جگە لە شاعیری ڕۆڵێکی ڕامیاری بینیوە وەک ئەم دوو شاعیرەی هاوچەرخی ( سان - ژۆن پێرس ، تلاودێل ) .

پاش گەڕانەوەی بۆ وڵات دەکرێ بە مامۆستای زانکۆ لە ساڵی ١٩٢٧ دەکرێ بە ئەندام لە ئەکادیمیەی ڕۆمانی . تاکە شاعیری ڕۆمانیشە نووسراوی فەلسەفەیی وەرگێڕرابێ لە ڕۆمانیەوە بۆ زمانی تری ئەورووپی .

شاعیر هەر لە منالیەوە چەکەرەی شاعیریو فەیلەسوفی لێ بەدیکراوەو لە ژێر کاری نووسەرو فەیلەسوفە ئەڵمانیەکان دابووە ، چونکە خوێندنی بە ئەڵمانی خوێندووەو چاک ئاگاداری ئەدەبی ئەڵمانی بووە . شاعیر بە یەکێ لە دامەزرێنەرەکانی شیعری تازەی ڕۆمانی دادەنرێ ، هەر چەندە شیعرو نووسینەکانی ڕێبازێکی ( سیمبۆلیبیان ) گرتووەو شێوەیێکی فەلسەفییان هەیە . خۆشەویستی ، نامەی پیرۆزی شاعیر بووە ، خۆشەویستی دەکاتە سەنتەرو چەقی هەموو ش[illegible]م جیهانە فراوانە ، خۆشەویستی خاکو سروشت ، خۆشەویستی ژیانو مرۆڤ ، خۆشەویستی هەر کارێکی پیرۆزو بیرێکی پیرۆز .

لە ساڵی ١٩٦١ دا کۆچی دوایی دەکاو ئۆپێراێتێکی زۆر فراوان بۆ گەلی ڕۆمانی جێ دێڵێ بریتیە لە شیعرو دراماو نووسینی فەلسەفیو بابەتی تری ئەدەبی ، جگە لەمانە گەلێ نووسینی هەیە بە زمانانی تری ئەورووپیو زۆر نووسراوی ئەدەبی وەرگێڕراوە لە ڕۆمانیە وە بۆ زمانانی تر .

سێ نموونەی شیعریم هەڵبژاردووەو دەستکاری هیچیم نەکردوە نەفۆرمو نە تێکس بۆ ئەوەی شێوەی بیرکردنەوەو بۆ چۆنی تایبەتی شاعیر دەرخەمو بە پێی بۆ چۆنی خۆشم هەر پارچەیێکم هەڵسەنگاوەو ڕوونم کردۆتەوە .

ئەمەش نموونەی شیعرەکانو لە کۆتایی هەر پارچە شیعرێك ڕوونکردنەوەکانیان پێش چاو دەکەون .

**پارچەی یەکەم**

**﴿ بێ دەنگی ﴾**

ئەوەندە کپو خامۆشە دەورم ، وا دەزانم
گوێم لێیە چۆن تریفەکانی مانگ شووشەی پەنجەرەکان دەبڕن
لە سینەمدا چریەیێکی نەناسراو دەنگ هەڵدەبڕێ،
ئاوازێکیش سۆزێکم پێ دەبەخشێ،هی خۆم نیە.
دەڵێن ئەوانەی بە گەنجی دەمرن ،
بە خوێنێکی هەڵچووەوە دەژێنەوە
بە سەودایێکی ئاگرین لە خوێنەکەیاندا دەژێنەوە

بە خۆرێکی گەش لە سەوداکەیاندا دێنەوە
دێن تا ئەو ژینەی نەیژیاون لە گیانی ئێمە بیژێننەوە .
ئەوەندە کپو خامۆشە دەورم ، وا دەزانم
گوێم لێیە چۆن تریفەکانی مانگ شوشەی پەنجەرەکان دەبڕن .
ئای کێ دەزانێ گیانی تۆش لە کام سینەدا دەنگ هەڵدەبڕێ
دووای چەند هەزار سالێک ، پاش بێدەنگیە شیرینە ڕاکێشراوەکەت
بە سەر سازی تاریکیو هەستە خنکێنراوەکەتو شادیە بچڕاوەکەت
کێ دەزانێ ؟ [illegible] ؟

هەرچەند بیرۆکەی لەم شیعرە لە فەلسەفەی کۆنی گریکەکان وەرگیراوە بەڵام شاعیر مەبەستی ئەوە فەلسەفە ئەفسانەیە نیە ، بە پێی بۆ چونی من چونکە شاعیر دەیەوێ ئەوەمان بۆ دەرخا هەر نامەیێکی پیرۆز نامرێو دەگاتە ئەنجام ، چونکە دەڵێ بە خوێنێکی هەڵچوەوە دەژێینەوەو بە سەودایێکی ئاگرینو بە خورێکی گەشەوە دەژێینەوە ، واتا مەبەستی گەیاندنی نامەی پیرۆزی مرۆڤایەتی یە ئەگە نەوەیێک نەیان توانی تاسەر بیبەن ئەوا ئەو نامە پیرۆزە هەر دەگاتە ئەنجام ئەگەر پاش چەند هەزار سالێکیش بێت .

## پارچەی دووەم

### خەمناکی

بایێکی ئاوارە فرمێسکە ساردەکانی
لە سەر شوشەی پەنجەرەکان دەسڕێ
باران دەبارێ !
پەژارەیێکی بێ « هۆ »م لێ دەنیشێ
بەڵام ئەو ئازارانەی هەستیان پێ دەکەم
لە دڵم دا نیە .. لە گیانم دا نیەو لە دەروونیشمدا نیە ،
بەڵکو لەو دڵۆپە بارانانەدایە کەوا دادەچۆڕێن
ئەو جیهانەی لە گیانمدا موتوربە کراوە
بە پایزو ئیوارەکانیەوە
وەک گلی برینێک ئازارم دەدات
ڕووەو کێوەکان بار دەکەن هەورە بارسەنگینەکانو
باران دەبارێ !

لە پارچەی دووەمدا شاعیر تابلۆیێکی پایزیمان بۆ دروست دەکاو دەیدوێنێ ، شاعیر خۆی زۆر لە سروشت نزیک دەکاتەوە تا هەست بە ئازارەکانی سروشتیش دەکات ، هەموو پایزو خەزانێکیش زەبرێکی کاریگەریان هەیە لە سەر ئەم شاعیرە هەستیارەی هەست بە ئازاری هەموو شتێك دەکات لە پایزاندا سروشت شینی خۆی دەکاتو فرمێسکی سارد دەبارێنێ چونکە پیر دەبێتو پرچی زەرد دەبێتو خەزانی لێ دەنیشێ، دەبینین شاعیر وەک دۆستێکی گیانی بە گیانی

سروشت دەنگ هەڵدەبڕێو بەشداری خەمی سروشت دەکاتو دەیلاوێنێنەوە بۆیە دەڵێ :
ئەو جیهانەی لە گیانمدا موتوربە کراوە
بە پایزو ئێوارەکانیەوە
وەک گلی برینێک ئازارم دەدات .

## پارچەی سێیەم

### ئێوە ئەی کێوە بەرزەکان
### لە شێکم پێ ببەخشن

هەر تۆ شک نەبەم ئەی لەشە گەڕۆکەکەم
کە چی هێشتا گوڵی سوورو سپی نادەم لە ناوچەوانو
پرچە تێک ئاڵاوەکەت
هەر چەند قوڕە بێ هێزەکەشت
زۆر تەسکە بە بەری ئەو گیانە مەزنەی هەڵیدەگرم
ئێوە ئەی کێوە بەرزەکان لەشێکم پێ ببەخشن
ئێوە ئەی دەریاکان ، لەشێکی ترم بدەنێ
تا بتوانم ، شێتی یەکەم بە جارێ ڕۆکەم
ئەی زەویە فراوانەکە تۆ ببە بە جەستەم
تۆ ببە بەسنگی ئەم دڵە پتەوەم
تۆ خۆت بدەرە بەر ئەو زریانانەی دام ئەپلۆسێنن
تۆ ببە ئارامگای ئەم گیانە یاخییەم .
تا دەگاتە گوێی ئاسمان
ئەوسا سەدای هەنگاوی پڕ هێزم
تا دەردەکەوم لە نێواندا سەربەستو پڕتەو
بەو شێوەیەی هەم ، ئەی زەویە پیرۆزەکە .
کاتێ ئەڤیندار دەبم
دەمەوێ دەریاکان ڕووەو ئاسمان ڕاپێچ کەم
وەک دوو بازوو پڕ هێزی کیویلکەو بە کوڵ
ڕووەو ئاسمان تا دەستگیری کەمو
سنگی بێنمەوە یەکو ئەستێرە وورشە دارەکانی

تێر تێر ماچ کەم .
کە ڕۆیشتم هەڵدەستێ
دەمەوێ خۆرە بێ تاوانەکان
لە ژێر پێیە بەردینەکانمدا بهارێو
بێشمە خەندە .

لە پارچەی سێیەم دا ( لوکیان بلاگا ) پەنـا دەباتە بەر کێوەکانو دەریاکان بۆ ئەوەی لەشێکی گـەورە تری پێ ببەخشن تـا بتوانێ ئەوەی لـە دەروونو گیانە مەزنەکەی دا هەیـە دەری ببڕێو بیدرکێنێ . لە کۆپلەی یەکەمی شـــیعرەکەدا دەڵێ :

ئەو گیانە مەزنە پڕ هەستەم زۆر گەورە ترو فراوان ترە لەو تۆزە قورەی لەشم ، بەڵام هەر ئەو لە شەشکت دەبەم بۆ ئەو گیانە مەزنە ، کەچی شانازی پێوەناکەمو نایڕازێنمەوە .

لە کۆپلەی دووەمیـدا پـەنـا دەباتـە بـەر کێوەکانو دەریاکان بۆ ئەوەی لەشـــێکی تری بدەنێ گەورە ترو بە هێز تر بێ تا بتوانێ ئەوەی هەستی پێ دەکات دەری ببڕێ ، لێرەدا دەبینین شاعیر وردە وردە پەنا بۆ شتی گەورەترو فراوانتر دەبا کاتێ دەڵێ ئەی زەویە فراوانەکە تۆ ببە بـە جەستەی ئەم گیانە بەرزو پڕ هەســـتەم تا لە کۆپلەی سێیەمدا پەنا بۆ ئاسمانیش دەبـات بۆ ئـەوەی ئاگاداری هەســـتی دەروونـە گـڕ سەندووەکەی ببێ تا لە کۆتاییدا پەنا دەباتە بـەر ئاسمانو زەوی بەیەکەوە ، دەبینین هەســـتو شیرازەی بیرکردنەوەی شاعیر ئەوەندە فراوانـە دەیەوێ جیهان بە ئاسمانو زەوییەوە داگیر بکات تا بتوانێ ئەوەی لە دەروونی دا دەژیو هەســتی پێ دەکات بیدرکێنێ .

لە کوپلەی چوارەمو پێنجەمیشـــــدا لێک چوێنێک ئەنجام دەدات بۆ ئەوەی نیشانمای بدات کـــە زۆر بـــە گـەرمیـەوە ئەڤینـدار دەبێتو خۆشەویســـتیەکەی زۆر مەزنە هەروەها ڤینو ڕکەشی لە هەمان کێشدایە زۆر توندو بە تینە .

## پەڕاوێزەکان :

١ ــ **وڵاتی ــ داک** : داک ئەو نەتەوەیە بوون کـە لـە خاکی ڕۆمـانیـادا دەژیان پێش داگیر کردنی لەلایەن ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانەوە .

٢ ــ **بۆرێبستا** : پاشـایەکی ( وڵاتی ــ داک ) بوو سەر دەمی حوکوم دارێتی دەگەڕێتەوە بۆ ( ١٠٠ ساڵ پێش زایین ) .

٣ ــ **ئۆڤیدیو** : شـــاعیرێکی بەندی لاتینیە ، شیعرو نووســـینەکانی بۆ جوانی ئافرەت تەرخان کردبوو . لـــە ســـــەردەمی ئیمپراتۆری ڕۆمانی ( ئۆگۆستۆس ) دا لـە بەر چەنـد هۆیێک دوور دەخرێتەوە لـــە ئیمپڕاتۆریـەتو دەنێردرێتـە ( وڵاتی ــ داک ) و لە شاری ( تۆمیس )دا نیشتە جێ دەبێو هەر لەوێشدا دەمرێ .

٤ ــ **گیتو ــ داک** : ئەو زم[illegible]ۆو نەتـەوەی ( داک ) پێی دەدوان .

٥ ــ **سلاڤۆ ــ بوڵگار** : ئەو وڵاتە بوو کـە لـە خواروی ڕووباری دانووب دا بنیات نراو زۆربەی نەتەوە سلاڤیەکان لەم ڕەگەزەن .

٦ ــ **سیمبۆلیزم** : ڕەمزیەتو بەکـارهێنـــانی ( ڕەمز ) لە شیعرو نووسیندا .

**ناتوڕیزم** : سروشـــت پەرستیو جوانی سروشت دەرخستن لە شیعرو نووسیندا .

٧ ــ **هۆمێرو ڤیرگیلیو** : دوو شاعیری ناوداری لاتینین .

## ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە :

١ ــ میخایل ئێمینێسکو (شیعر ، ساڵی ١٩٧٧) نووســـینی : دۆیێ دومیتریســـکو ــ بو شولێنگا . بخارێست . بەشی دووەم .

٢ ــ میخایل ئیمینێسکو (شیعر ، ساڵی ١٩٦٥) پێشەکیەکە ، نووسینی : مامۆستای زانـاو ئـەدیبی بـــە نـاوبـانگی ڕۆمـانی ( تودۆر ئارگێزی )یە .

٣ ــ فەرهـەنگی ئەدەبی ڕۆمـــانی نوێ ( ١٩٨١ بخارست ) بەشی یەکەم ، شیعر .

٤ ــ فـەرهەنگی زمـانـانی ڕۆمـانی نوێ چاپی ( ١٩٨١ ) بخارست .

٥ ــ لوکیان بلاگا ( شیعر ١٩٨٠ ) نووســـینی ( گیۆرگێ گانە ) بەشی یەکەم .

٦ ــ پەخشانە شیعریەکانی ڕووناکی ( ١٩٤٢ ) شیعر لوکیان بلاگا .



# میرزا ئۆلقادر

* محەمەد ئەمین هەورامانی *

### ((( کورتەی ژیانی )))

میرزا ئۆلقادر کوڕی کوێخا محەمەدی پاوەیی‌یە ، لە ساڵی ( ١٢٦٦ )ی کۆچی لە شاری ( پاوە )ی هەورامانی (( لهۆن )) لە دایك بووە ، ئا ، لەوێ ؛ نراوەتە خوێندنو پلەی سەرەتایی خوێندنی دینی تەواو کردووە .

بۆ تەواوکردنی پلەی خوێندەواریی دەچێ بۆ دێیی ( کاشتەر )و لە خزمەتی شێخ غەفوور ـ ی مەردوخی ـ دا ، علوومی دینیو عارەبی دەخوێنێ . پاشان بۆ شاری پاوە دەگەڕێتەوەو لەوێ نیشتەجێ دەبێ .

لە ساڵی ( ١٣٢٨ )ی کۆچی ، لە تەمەنی ( ٦٢ ) ساڵی ـ دا ، هەر لەوێ بۆ یەکجاریی کۆچی دوایی دەکاتو سەری هەمیشەیی بەخاکەوە دەنێتەوە .

بە شیعرەکانی ـ دا ، وامان بۆ دەردەکەوێ ، کە دەردیسەرییەکی زۆری کەوتبێتە بەرو تاڵو سوێرییەکی زۆری بەدەست زەبرو جەوری زەمانەوە چەشتبێ ، بۆیە بە ئاشکرا ئەو جەورو ستەمو ناڵەبارییەی ئەو زەمانە ، لە نێو دوێ توێیان ـ دا رەنگیان داوەتەوە .

تەماشا کردنێکی سەرپێی بەرهەمەکانی ، وامان بۆ دەردەخەن کە میرزا بۆ چەند جارێ ، دوور خرابێتەوەو بۆ دەرەوەی شاری پاوە دەستبەسەر کرابێ .

هەرچەندە هۆی ڕاونانو دوورخستنەوەو دەستبەسەریی میرزامان لا روون نییە ، بەڵام بەلای ئێمەوە ، جگە لە هۆی دڵسۆزیی بۆ نیشتمانەکەی ، بە پێی پێناسەکەی خۆی ، هیچی دیکە نەبوە !!

بەڵگەشم بۆ ڕاستی ئەمە ؛ یەکەم ، نووسینی ئەو بەرهەمانەی بە زمانی کوردیی شێوەی هەورامانیع ، کە خۆی لە خۆیداو لە جەوهەریدا چیزەیەکی نیشتمانپەروەرییە ، چونکە پەنا نەبردنی بۆ زمانی بێگانە ، بۆ خستنە رووی بەرهەمەکانیو بەکارهێنانی زمانی دایکزادی ، مەبەستی پاراستنو گەشەکردنی زمانەکەیەتی ، کە لە راستی ـ دا بنیاتنانێکی گرنگی هێشتنەوەی نەتەوایەتییە ، بە پێچەوانەی زوربەی هاوسەرانی کە پەنایان بردۆتە سەر زمانی فارسی یا تورکی ـ یا یەکێکی دیکەو بەو جۆرە ـ بۆ خستنە رووی هەستو نەستی دەروونی خۆیان .

دووەم ، بە ئاشکرایی ، لـە شیعرەکانیا ، هاواری بێ زێد ـ ی دەکات‌و لە زێدیش مەبەستی جێگای لە دایك بوونیەتی کە شاری پاوە ـ یە ، کە ئەمەش خۆشەویستیەکی زۆر رەوایە ، چونکە ئەگەر یەکێك جێگای لە دایکبوونی خۆی کـە بـە ئاوهەواو میوەهات‌و جۆرەها بەرو بوومی تـری گـەورە بووە نەیـەوێ‌و رێـزی لێ نەگرێ‌و بـە پیرۆزی نەزانێ دەبێ چۆن ئەو نیشتمانەی خۆش بوێ کە تیایا دەژی !

میرزا ، بە ئاشـــــکرایی‌و بە دەنگی زولاڵ دەچرێ چونکە هـەروەك دەڵێ ، لـــە نەدامـەت دەترسێ‌و خەمی ئەوەیەتی کە دێی « هاوار » بـە یەکجاری ببێ بە جێگای مانەوەی ، بۆیە دەڵێ :

**« هاوار ، مەتەرسوون ، چە رووی نەدامەت**
**هاوار ، بۆ ( زێد )م ، تـا رووی قییامەت »**

دیارە ، میرزا ، وا لە دێی ( هاوار ) ، کـە کەوتوەتە لای رۆژهەڵاتی ژووری هەڵەبجەوەو لە داوێنی دۆڵی شنروێ‌و چەمی تەوێڵەداو بە لایەوە وایە ، کە هەتا هەتایە هـەر لەوێ دەمێنێتەوە ، چونکە ئەگەر مەسەلە زۆرە ملی نەبێ ، خۆ ماوەی نێوان هاوارو پاوە ئەوەندە دوور نییە تا وەکـو میرزا هەناســەی دەروونی دووکەڵی دووریی لێ بێتە دەرەوە !!

سێیەم ، وەختێ ئەم ڕاستیەمان زیاتر بۆ روون دەبێتەوەو دەردەکـەوێ کـــە بـەرهـەمی « جەنگنامەی کوللەو ئاینەمەل »مان بەوردیی‌و بە چاوی لێکۆلینەوەوە خوێندەوە . ئـەویش بـەم جۆرە دەست پێدەکات :

**« یا کـەریمی حەق ، یـا کـەریمی حەق**
**یا فـەردی بێچوون ، یـا کـەریمی حەق**
**یا بنیـای بێ‌بـاك مـەوجـوودی مـوتلەق**
**یا سازندەی چەرخ ، بێ‌ستوون مەولە ق »**

ئەو جا دێتە سەر ئەوەی کە بڵێ :

**« یـا ( مالك الملك ) ســـەماو سەربیسات**
**چە دەســـتی مەلەخ پێمان دەی نەجات »**

تا کۆتایی جەنگنامەکە بەم جۆرە کۆتایی پێ دەهێنێ‌و دەڵێ :

**« یـاران ، یـە نـامـەی نەهاتی ( پاوە )ن**
**مەعلووم نامـەد ـ یش جـەلای خواوەن »**

چوارەم ، تاریفـدان‌و بـە جـوان‌و رەنگین زانینی ناوچـەو چـەم‌و دۆڵ‌و شاخ‌و کێوو کـانی مێرگـزارو رووبارەکـانی ( لهۆن )و بـە ( زێد ) زانینی ( پاوە ) بە جۆرێ کە سەرچەمەی ئـاوی ژیان بێ ، ئەوە ، ئەو جۆرە نیشتمانپەروەرییەی میرزا پیشان دەدا ، بە شێوەیەکی روونتر دەیەوێ بڵێ ، ئەگەرچی کوردستان زۆر ڕەنگین‌و رازاوەو دلگیرەو بەهەشتی سـ[illegible] لهۆن ـ یش ئەگەرچی هەرێمێکی رەنگین‌و جوانی دیاریی سەر رووی زەمینە بەڵام شاری پاوە ـ ش سەرچاوەی ژیانیەتی ، چونکە جێـگای لـە دایکبوونیـەتی ، تەماشا :

**« شـــەماڵ نیگاش کەر چەخاس دلگیرەن**
**چە ( ویی میر ) وارتـەر هـەولی سەراوەن**
**سەر چەشمەی حەیـات زیندەگی پاوەن »**

### بەرهەمەکانی میرزا ئۆلقادر

**١ ـ شـــایەنی باســـــە ، میرزا هەروەك شاعیرە هاوچەرخەکانی ، حەزی لە شـــیعری غەزەلیـات ـ دا کولاوە ، لـەم بابـەتەش زۆری هۆنیوەتەوە ، بەڵام ئەوەی جێگای داخە ، لەگەڵ گەڕان‌و بانگەواز دانیشا ، نەمانتوانی هەموویـان کـۆ بکەینـەوە ، جگە لەوەی کـــە لـە هەنـدێ رۆژنامەی وەك ژین‌و کوردســـــتان‌و هاوکاریی‌و گۆڤارە کوردیەکانی وەك گەلاوێژو بەیان‌و بە تاقو تـەراکیش لـە نێو دوێ توێی بـەیـازە شیعرەدا بلاوکراونەتەوە ، بێـگومـان ئەمانـەش هەموویان نین !!**

**زۆرتری ئەم جۆرە شـــــیعرانەی میرزا ، گۆرانی وتنـــە بـــە دەوری بـالای ( پـەریزاد ) ناوێك ـ داو لاشمان روون نییە ، کـە ئایـا ئـەم ( پەریزاد )ە ناوی ڕاسـتی کچەکەیە ، یاخـود یەکێکە ئـەوەنـدەی ( پەری )یێ جوان‌و ڕێـکو پێکە ، بۆیە بە پەریزاد ـ ی گاز دەکا .**

**لەم جۆرە شــــــیعرانەدا ـ پیاهەڵدان‌و دلـداری‌و گـۆرانی وتن ـ ئـەتـوانین بڵێیـن ،**

دەستێکی یەکجار باڵای هەبوە ، چونکە چەند وشەیەکی ئاسانو سادە پێکەوە دەنێ ، بە جۆرێ کە ئەگەر یەکێکی دیکە رێکیان بخات ، لەو بڕوایەدام ، هەرگیز بەو جۆرە پڕ واتا نابن ، هەروەها توانای یاری ـ کردنی بە وشە هەیە ، بۆ دەستکەوتنی چەند مەبەستێ چەند واتایێ ، ئەم جۆرەکارەش لە وزەی کەم کەس ـ دا بووە !!

ئەم وەرگرتەیەی خوارەوەش کە پێشەکی مەبەستەکەی روونەدەکەینەوە بەلگەیەکە ئەممان بە جوانی بۆ روون دەکاتەوە : لە دەشتو لە شاخ ، لەسەر بەفر لە هەر جێگایەك دەڕوانم ، وێنەی ئەوی ـ یارەکە ـ بە سەرەوە هەلکەندراوەو نە بەسڕینەوەی لە دڵو نە بە تاریککردنی رۆشنایی بنیاییش هەرگیز لە یادم ناچێ !!

**« ئەر دەشتەن ، ئەر کاو ، ئەرکەشەن ، ئەرکۆ**
**نە هەرجا مەدیەو ، نەخشەن ، شێوەی تۆ**
**نە حەکی چە دڵ ، نە مەحوی نەزەر**
**یادم نەمەشی وە مەرگت دولبەر »**

یاخود دەلێ :

**« من هەر تۆم هەنی ، نەك واچی تۆم بۆ**
**تۆم بۆ چەنی عام نییەن چەنی تۆ**
**تۆتۆ ، تۆی دەروون بگێلە پێش ـ دا**
**ئەر تۆ ، تۆییت دیی ، غەیر جە تۆ تێش ـ دا**
**تۆخوا وێت ـ ئاسا ، باوەرەش وە بەر**
**وە مەودای ئەلماس ، پارە پارەش کەر »**

ئەم پارچەیەی سەرەوە ، بە پێی وشە دارێژانو ڕیز کردنیان بە چەند جۆرێ لێك دەدرێتەوە ، بەلام لە جەوهەری واتاکەی ـ دا یەك دەگرنەوە ...

بە کورتی شاعیر ، پاکانە بۆ یارە خۆشەویستەکەی دەکاو دەلێ ، کە تەنها هەر ئەو خۆشەویستیەتیو هەرگیز هیچ کەسێکی دیکە نەئەچێتە جێگایەوە نە ئەبێ بە هاوڕێزو هاوکێشی ، بە جۆرێ کە هەمیشە هەروەك وێنەی هەلکەندراێ وایەو هێزیش نییە بتوانێ لەبەر چاوی خەیاڵی لایبەرێ یاخود بیسڕێتەوە .

یاخود دەلێ :

**« ئیمشەو قیبلەکەم لە من کەفتەن دوور**
**دوور بۆ لە دیدەش دیدەم بییەن کۆر »**

**ب ـ لالانەوەو پاڕانەوە :**

شاعیر بەرگێکی خواناسیو خواپەرستی کردووە بە زۆربەی شیعرەکانی ـ دا ، وادیارە ، ئەم بەرهەمی بە ساڵا چوونو گەڕانەوەیەتی . لێرەدا ئەگەرچی میرزا خۆی بە نەخۆشو گوناهبارو خەتابارو ملکەچ دەزانێ ، بەلام بە ئازایانەو دەم ـ دلێرییەوە گلەیی لە خوا ئەکاتو بۆی روون دەکاتەوە کە ئەگەر ئەم زۆریش خەتابارو گوناهبار بێ بەو جۆرە نییە کە لێی گیراوەو بە دەس ئازاریەوە نالەنالیەتی ! ئەمەش وەرگرتەیەکە ، لە یەکێ لەو قەسیدانەی :

**« فەلەك باری دەرد ، . . . . . .**
**تاکەی بکێشم ، سزای باری دەرد**
**وەهار دانەپەل ، زمستان وییەرد**
**تاکەی جەوری دەرد ، رەنگم کەرۆ زەرد**
**مەر پێت نە یاوان ، دوودی ئاهەمەن**
**هەناسانی سەرد ، سەحەر گاهەمەن »**

یاخود دەلێ :

**« کوفقارو کافر ، نەکێشام نەشار**
**زەکەریام نەکوشت ، بە مەودای مشار**
**بارەنەفت وە نار ، ( نەمروود ) نە پاشام**
**مەنجەنیق پەی مەرگ ، « خەلیل » نەتاشام »**

**ج ـ رازی شیعری :**

لەم جۆرە دوو وێنەمان هەیە ، کە لە ناوەڕۆکو بیرو چۆنیەتی داڕشتنی مەبەستیدا لە یەکتری جیاوازن ، جۆرێکیان زۆرتر داستانێکی مێژوویی رەمزیانەمان بۆ دەگێڕێتەوە ئەوی‌تریان دەمەتەقێیەکە ، لە نێوان دوو بێ‌گیان ـ دا رووی داوەو بە هۆی دەمپاراوی‌و مەنتیقەوە یەکێکیان بە سەر ئەوی تریان ـ دا سەرکەوتووەو ڕواڵەتێکی دینیانەی تیادا بە دیی دەکرێ .

لە سەرانسەری هەردووکیان ـ دا گفتوگۆیەکی دراماتیکی دەنگ دەداتەوە .

لە توانادا هەیە هی یەکەمیان ناوبنێین قارەمانە شیعر و هی‌دووەمیشیان شیعری ◁

دەمەتەقێی دراماتیکی ، کە ئەمە لە ئەدەبی عالەمیدا من بەش بەحالی خۆم بەرچاوم نەکەوتووە .

ئەمەی یەکەمیان بە نێوان دوو گیاندارەوەیە رەگەزی کوللـە ، رەگەزی ئاینـەمەل ، ئەمـەش لەراستیدا رەمزی دوو لایەنن ، لایەنەکیان هێرشی عوسمانیەکان بۆ سـەرخاکی کوردستانو لایەنێکی دیکەشیان هێرشی لەشکری فارسەکان بۆ سـەر هەمان خاکی کوردسـتان . شاعیر خـۆی سەرگوزەشتە دەگێڕێتەوە ، بـە پێی باسـای سەربازیی ، لێپرسراوانی لەشکرەکەش گفتوگۆ دەکەنو نەخشەو پیلان دادەنێنو لەسەر نەخشەی خۆیان دەڕۆن . گفتوگۆ کە شێوەیەکی دراماتیکی لە نێوان هەردوولادا وەرگرتووە . هی یەکـەیـان بیرێکی سیاسی هەلگرتووە ، بەلام هی دووەمیان بیری دینی .

سەرەتای ئەم جەنگنامەیەو ئەو سـەماو زەمینە بە موناجات ، لالانەوەو پاڕانەوە ، دەست پێ دەکەن هەروەك سەرپاکی رازە شـیعریەکانی دیکەی زاری گۆران ، خورشـیدو خاوەر ، هەیدەرو سـنوبەر ، کەنیزەکو یانزەرەزم ، شێخی سنعان ، شـیرینو فەرهاد ، بـارامو گولەندام ... و .. و هیتر .

میرزا جەنگنامەکەی بەم جۆرە دەسـت پێکردووە :

**« یـا کـەریمی حەق ، . . . . . . . .**
**یـا فـەردی بێچون ، یـا کـەریمی حـەق**
**یـا بینـای بێ بـاك ، مەوجوودی موتلەق**
**. . . . . . . . . . . .**
**یـا ( مالك الملك ) ، سـەماو سەربیسات**
**چە دەستی مەلەخ ، پێمان دەی نەجـات »**

سـەماو زەمینیش بەم جۆرە دەست پێدەکات :

**« یـاران زەمینەن ، . . . . . . . .**
**سـەیری گفتو گۆی ، سـەماو زەمینەن**
**موقەددیمەی تـەرح ، بـەزمی رەنگینـەن**
**مەعرەکـەی مەسـاف ، دنیـاو دینـەن**
**بەحسی قـەزیلـەت ، بەینی ویشـانـەن**
**نەمز تـا ئـاخـر ، هەمە وەکێشـانەن »**

## بەسەرکردنەوەی

کەلەپوور

**« کۆنترین گۆرانی فۆلکلۆری ، گۆرانی خۆشەویستییە**
**ئەو ئەوینەی بەتەنێ هی ئادەمیزاد نیە**
**بەلکو هی تێکرای گیاندارانە ! »**

« گۆرکی گیـانی شـادبێ وتوویەتی : سەرەتای هونەری وشە لـە فۆلکلۆردایە ، کۆی کەنەوە لێی وەکۆلن ، بە ئەندازەی ئەوەی کـۆن تێ دەگەین لە ئێستاش شارەزا دەبین » .

ئەوانەی ئاگایان لە فۆلکلۆری گەلەکەیـان نیـە ، بـە بێکاری دەزانن تاوێك بەدڵ گوێ بۆو بەیتو بالۆرە کوردییە کۆنـانـە شل کەن ، یـان هـەولێ بەرگ گـوڕینو ئـارایشت دانی بکەن ، نـە فـەرهـەنگی زمانـەکـەیان بەپێزەو نەزمـانی نووسیشیان شیرینەو قوڕتو پێچی تێدا نیە . رەنگە باشـترین بەلگە بەیتەکانی ئۆسکارمان بێ ، لای هەندێ شاعیرو چیرۆکنووس کار تێکردنەکە دیارەو لای ئەوانی دیکەش مایەی خۆیانە ! بۆیـە ئەمانەی دوایی ئەگەر تووشی وشـەیەك ، گوزارەیەکی ئەوتۆ بێ نەیان بیستبێو مانـاکـەی نەزانن سـەرگران دەبنو لە هەرزەیی خۆیانەوە پێ دەکەنو بەکوردی نـازانن .. خۆ دیـارە نرخی بەیت لـە چوار چێوەی وشـە دەولەمەندیدا نامێنێتەوە .. یەکێك بە وردی زەینیدا کێشـە ( وزن ) خۆمالییەکان .. یان کێشی تایبەتی ئـەو بەیتانە دەدۆزێتەوە ، زۆر جـار ـ ئەگەر نەلێین

# بەیتی خەج و سیامەند

جەزا عەلی ئەمین

هەمیشە ـ بەیتەکە بە سەروایەك کۆتایی دێ چەند کۆپلە بەهەمانْ سەروا بەرێوە دەرۆن ..

ئاوئاو بەیتی ئاوازی شادی یان ئاوازی حەماسی، یان خەمباری کێش‌و سەرواکان دەگۆڕێن ..

وا رێ دەکەوێ بەیتێك بەسەروایەك دەست پێ بکاو کۆپلە بە دوای کۆپلەدا بەو سەروایە ببڕێتەوە .. تا کۆتایی .. بەو سەروایە جۆرە ئیقاعێکی خۆش دروست دەبێ .. با زەین دەینە بەیتی سوارۆ :

**«دوێنێ چوونەئە سوارەکەی من دەچووە سەفەری**
**کاولەلئەحسایە**
**دەیگوت : کیژێ**
**وەرە کیژێ دوو ماچم دەدەیە**
**بە سەری بە قوڕو بە ملی بە کوبنم**
**خۆم لێ وەردەگێڕا**
**هەی لاڵ بم نەمدەدایە ! »**

بەلام کێشی بەیتەکان پێویستی بە ورد بوونەوەو لەسەر ڕاوەستانە تا بۆت یەکلا دەبێتەوە چۆنە . جا ئەگەر ناو بەناو سەرە دەری لێ نەکەین وەك شێوە تووشی کەلەبەرو قرتاندن‌و بەرزی‌و نزمی بین ئەوە سەرواکان بە خۆیان‌و باڵی ئاوازیانەوە کۆپلەکان دادەپۆشن ، ئەو وێنە شیعرییە ئاوازانەی رژاونەتە بڕگەکانەوە تۆڵەی کێش دەکەنەوە .. ئەگەریش سەرنج لە ناوەرۆکی ئەو بەیتانە بدرێ ئەوە هەموو بەیتەکان بەتایبەتی ئەوانەی بەرگوێ کەوتوون‌و دیتوومانن چیرۆکێك دەگێڕنەوە .. جاروبار خۆ لە قەرەی مل ملانێی چینایەتی دراوە ، یان باسی دڵ قایمی‌و جوامێری کوردان کراوە .. ئەوین جا بە ئاکام گەیین یان داستانی بەدرك خەملێوی خۆشەویستی بێ‌و بە نامرادی بڕابێتەوە .. لە زوربەی ئەو بەیتانەدا کە تەرخانن بۆ ئەوین بەکر مەرگەوەڕو گولەکی دەگولە مێردان وەك سندان لەبەر بینیان خڕ بووەو بێ باکانە بە ناو سوورایی ئاگردا بە دوای گراوی خۆدا رۆیون‌و وەك ـ برایم ـ ئاگریان بۆ سارد نەبۆتەوەو لەنێلە نێلیدا سووتاون .. یان بوونە گرێکی قەت نەکوژاوەی خۆشەویستی .. بەیتی واشمان بەر چاو دەکەوێ لە خۆشەویستی تاکە کەسییەوە هەڵی بواردووە بۆ دڵداری خاك‌و مرۆڤایەتی .. بەکورتی ئێمە

دەتوانین بە هۆی ئەو بەیتانەوە چمکێك لەژیانی ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و رۆشنبیری گەلەکەمان بزانین‌و پارسەنگی رابردوومان بێ رووتووش بۆ دەرکەوێ ..

وا بەنیازی وروژاندن‌و بەسەر کردنەوەی بەیتی کوردی لەگەڵ خەج‌و سیامەندا بەیەك دەگرینەوە .

کرۆکی ئەم بەیتە لە خۆشەویستی دەدوێ .. ئەوینێکی ئەوتۆ بە تراژیدیایەك کۆتایی دێ دڵی بێ دڵانیش دەگرینێ ! بەراست ئەگەر وەك دیمەن بیهێنینە بەر چاو زەینی دەینێ نرخی خۆشەویستمان لا بەهاترو ئافرەتمان لا دڵسۆزتر ◁

دەبێ .. گەرچی مردن بە مردن زیندو نابێتەوە ، بەڵام ئەگەر سنوور یان پارسەنگێك هەبێ بۆ خۆشەویستی ئەوە دیارە لەگیان تێ‌ناپەڕێ ..

ئەم خۆشەویستییە بێ نموونەییەی خەج‌و سیامەند ئەنجامەکەی بەوەدا دەشکێتەوە تەنانەت بە مردوویش پێك نەگەن ! خۆ ئەو دارەی بە دڵی سیامەنددا دەچێ ، دڵی خەجێش دەبڕێ بەڵان دارەبەن دەشکێ .. بۆ شکا ؟ ئاخۆ لەبەر قورسییانە ، یان داریش وەك بەشێك لەسروشت دەیەوێ هاوکاری لەو کەوتنەدا بکاو نەهێڵێ ئەو دوو دڵخوازە پێك بگەن ؟ ئەوان لە ناو دێ بەهۆی باری نا ئابووری سیامەندەوە خەجی نەدرایە ، بۆیە هەڵدێن تا لە کێوی بینە هاو ڕازی یەکدی..

کەچی لەوێش پەلی دارە بەنێ دوژمنایەتییان دەگەڵ دەکاو جیایان دەکاتەوە .. ژیانێکی سەیر (١) لە ناوەدانیدا کۆمەڵێ ( قیەمی ) کۆمەڵایەتی ، ئابووری لێکی کردن (٢) سروشت بەهۆی دارە بەنەوە جیایی پێ بەخشین .. دەشێ بلێین پەلی دارە بەنێ بەکر مەرگەوەڕی ناو دارانە ! با خۆشی بەوە نەزانێ .. دوای ئەم پێناسینە کورتە با هەنگاو بە هەناو لەتەك خەج‌و سیامەنددا بڕۆین‌و بەیتەکە هەڵپشکنین . با لە سەرەتاوە دەست پێ‌بکەین .

* * *

لەوەی دەچێ خەجێ لەدڵی چەسپی بێ گراوییەکەی تووشی بەڵایەکی نهێنی دەبێ‌و لەکیسی دەچێ .. ئەوین وا لە برسێتی خەجێ دەکا بە تێری بگێڕێ .. خۆ دیارە دەورو بەر وایان کردووە خەجێ تووشی دڵە ڕاوکێ‌و گومان‌و ترسی بێ ..

خەج دەڵێ :

**« توخوا با هەر برسی بین**
**هەر خوڕێن بین**
**مەکوژە چ نێرییە**
**مەکوژە چ بزنە »**

ئەم قسە کردنەی خەجێ لە کاتێکدایە ڕەوە نێری‌و بزن هاو شانی یەکدین .. هەموو نێرییەك بزنی خۆی لەگەڵە ! لێرانەدا بەیت بێژ لە سەر زمانی خەجێ وێنەیەکی ستاتیکی سەر بلندمان پێشان دەدا ، ئەویش بە شێوەیەکی ناراستەو خۆ لە ئەوینێك دەدوێ بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە . کوشتی تاکێك لەو جووتانە کوشتنی جووتەکەیە !

**« مار خەراپ سیامەند**
**فکرێ لە جاری من بکە**
**ئەمزو تۆ جووتین لە سیپانێ**
**ئەگەر تۆ بێیە کوشتنێ**
**پاشی تۆ چەند عەمودارم**
**چەند هەژارم ! »**

سیامەند وای وەڵام دەداتەوە :

**« مار خەراپ**
**یەکێ هەبێ ئەتۆ لە من زەوت بکا ! »**

وەڵام دانەوەی سیامەند ئەوە دەگەیێنێ سیامەند لەمەبەستی خەجێ نەگەییوە ، وەك هەرزەکازێکی خوێن گەرم‌و یاخی ، لە کێویش بێ‌و چیاش خود بەسەر جۆرە غرورێکی تایبەتی خۆی هەیە .. خۆ ئەگەر چەکیشت پێ بێ ئەوە وەك دەڵێن شا بە سەپانی خۆ نازانی .

بۆیە لامان وایە لە مەبەستی خەجێ نەگەییوە ، ئەوەتا لەو دەمەدا نێرییەکی تەنیا دێ خەج سیامەندی ئاگادار دەکاتەوە بکوژێ ئەوێ نێری حەفت سالی .. چونکە بێ شەریکە — بێ ئەوینە — ئەگەر لەبارەی دەروونییەوە لێی وەکۆلین بۆمان دەردەکەوێ .. کوشتنی نێری تەنیا کوشتنی تەنیایی خەجێیە . یان کوشتنی ئەو بیرکردنەوە چەوتە خەجێیە ، کە پێی وایە هەموو ( نێرە وەزێك ) دوژمنی سیامەندەو دۆستی ئەمە ! یان مرخی لێ خۆش کردووە . یان تەنیایی دێنیتە مێشکەوەو لە جووتی دەکاتەوەو خەج دەبێتەوە بە ڕەبەن ! خەجێ ڕقی لە تەنیاییەو دەیەوێ هەمواری‌کا .

سیامەند دەڵێ :

**« بکوژم کێوێکی**
**ئەتۆ بکەی چێشتەو پراوێ لە بنێ »**

سیامەند تیر دەنێتە کەوانەوەو ( نێری تەنیا ) دەئەنگێوێ ، هەر ئەو نێرییەی خەج دنەی دا بیکوژێ کەچی دەڵێ دوای مەکەوە ، با بە برینی خۆیەوە مردار بێتەوە .. ئەو ترسەی باڵی بەسەر بیرکردنەوەی ( خەجێ )دا گرتووە

نەڕەویوەتەوە .

« ئەگو لە بەر برینی خۆ غارت بداتێ
لە چیایێ سیپانێ فرێت بدا
با من پاشی تۆ بە غەریبی
بە تاقی تەنێ نەمێنم
لەوان گەرووا
لەوان کێلا
های لە سەری سیپانێ »

ســــــیامەند بۆ دووەم جار بێ دڵی خەجێ دەکاو بــە دزی [illegible] داردا دەڕوا .. ئــەو گەلێك لە خۆ رازی بوو بڕوایەکی تەواویشی بــە خوای خۆی هەبوو دەیوت هەرچی ئەو بیکا ڕەت نابێتەوە .. ئەوەتا بەیت بێژ لەســــــەر زمانی سیامەند مێردە زمەی مردنێ زۆر بە جوانی دیاری دەکا :

« دەستی مفەدەرێ پێنج ئەنگوشتن
دوو دەکەونە سەر گوێیان
دوو دەکەونە سەر چاوان
هی پێنجەی دەمو ئەبووان لە بەشەری دەگرن»

کاتێ مردنی بەسام دێ گوێ دەگیرێ چــاو ڕووناکایی نامێنێو ئیشـــــکەکانی دەنووسێن .. دەمو لووت دادەخرێن ، بەو جۆرە مرۆ پێشوازی مردن دەکا !

★ ★

سیامەند وردە وردە لەسەر چیای سیپانێ دەچنە خوارێ ســــــەری پشتێنەکەی داوە بــە خەجێ .. تێریش ئاوا دەردەکەوێ :

« نێری خۆی هاویشتۆتە
ناو بنچکی ڕیواس‌و خاوێ
خۆی لە ناو کنێران بزر کردییە
نێری بە زمانۆکێ خۆ
خوێن لەدامەنی دەلێسێتەوە »

نێری دەیەوێ خۆی وەشارێو ســــــیامەند نەیبینێ ، یان دەخوازێ لە پەنا ڕێواســــــان خۆ مات کاو زەفەر لە سیامەندی بێنێ ، نێری حەز نــاکــا خوێنی لــەبــەر بڕوا ، بۆیـــــە کــەوتۆتــە لستنەوەی .

خەج کاتێ خوێن دەبینێ ترسی ڕێ دەنیشێ، هاوار بە سەر چیای سیپانیدا پەخش دەکــا تــا ســــــیامەندی تازە زاوا ئاگادار کاتەوەو لــەڕێی مردنێی بگێڕێتەوە ..

« شیرنێ من ! لە خۆ هشیار بە
لاوە کسکوکە
زاوایە شلکوکە
لە خۆ هشیار بە
با لەپاشی تۆ ئەو بووکە

سەر بە زێڕو گەردن زەردە
نەمێنێ هەر لە سیپانێ »

خەج مانەوەی خۆی بــە بوونی سیامەندەوە گرێ داوە . تەنــانــەت پێی وایــە دوا بــە دوای ســــــیامــەنــدی وەك تــەم دەڕەوێتــەوە .. سەردەمی دەرەبەگایەتی بووە ، ئافرەتێك لەگــەڵ پیاوێکا بێ دڵی داكو بابی وەدەرکەوێ کوا ڕووی دێ جارێکی دیکە ســــەر بکاتەوە بە ماڵە باوانی خۆیدا .. ئەم قســــــەیە ، ئەم خوو خدەیە تــا ئەمڕۆش بە بڕشتە . بۆیە جێی گلەیی نیە ئافرەت بە سەنگ‌و مەکی دەرەبەگان وا بقەبڵێنــدرێ . بەیت بێژیش بێ دەســــــکاری گێڕاوییــەتەوە . لە بەیتەکەدا وەکی مرۆ مامەڵە لەتەك نێریدا کراوە، بــەیت بێژ لــە برینی نێری بیری کــردۆتــەوەو دواوە ! ئەمەش لایــەنێــکی جــوانی بــەیتەکـــە دەردەخا . ئەوەتــا چرکژنی چەقوێ نێری حاڵی دەکا مردنی نزیك بۆتەوە .. ها ئێستا ، یا تاوێکی کە دەبێ چاوانی لێك نێ ئەم دنیــا سەوزە بەجێ بێڵێ .. ئەو هاوەڵانەی بە تەویای کردوون دەبێ هەمواریان کا . کێ دەڵێ تەنیایە ؟ دوور نییە لــە دۆستەکەی بگەڕێ ! نابێ بێ دەنگ بــە پیر بــای مردنێوە بچێ .. بــا قۆچێکی دابێنێتە کــاکـــە ســــــیامەندی تا دڵی ناسکی خەجێ وەك بێژنگی لێ بێ .

بەڵام بەیت بێژ هەر هێندەی نرخ بۆ نێری داناوە تا ســــــیامەند بریندار دەکا .. برینێــکی دژوارتــر دێتــە گۆڕێ .. نێری دوای ئــەوەی قۆچێك حەواڵەی سیامەند دەکا پشتی سیامەند دەکەوێتە سەر پەلێکی تیژ ئیدی باسی ناکرێتەوەو چیرۆکی نێری لێرەدا تەواو دەبێ .

سیامەند بۆیە لە دوو نێری‌را چوو تـا پەلی داری بکاتە شیشی کەبابێ . کەچی گۆشـــتی کەبابەکە دڵی خۆیەتی . بەیت بێژ وێنەیەکی هەرە دڵتەزێنی گرتووە .. خەج لە سەر چیای سیپانێ دەبێتە ســـەیرانکاری سیامەندی بریندار .. سیامەند لە دەرووبەك دەگەرێ تێیرا بێتە دەرێ . ســـیامەند بەبێ هیوایەکی زۆرەوە بـە خەج دەڵێ :

« تەگبیرم نینە
وازم لێ بینە
عومری خۆ لە سەرمن مەچووینە »
« خەجێ ! ئەتۆ بە چارۆکی مەلۆکی کچانی
بە کراسی خامۆکە شینە
هەرۆ کێلە شینە
دەڵێن بەو سپیانەی
چواردە گەنجو میری حسێنیان
لە ماڵی بابی من میوانن
هەرۆ بۆ خۆن یەکێ
لەوان بگرە
خەمی خۆ بەو لاوە برەوێنە ! »

* *

گەر بـەوردی لـەم دوو کۆپلەیە وردبینەوە هەندێ شتمان بۆ دەردەکـەوێ . ســـیامەند دەستی لە خۆی شتووەو نایەوێ خەج خۆی بۆ قیامەت هەڵـگرێ ، بەڵام لـە کۆپلەی دووەمـدا دەیـــەوێ خـــەج تـــاقی وەکـــاو رادەی خۆشەویستییەکەی بزانێ ، پێشی دەکەوێ گوایە میر زادەی ، یەکە ، یەکە لە ماڵی وان میوانن ، ئەمەیان وەك دابو دەســـتووری کوردەواری قبـوول نیـە بووك بـە پەنجەی خەناوییەوە بـۆ زاوایەکی ملە ستوور بگەرێ ! یـان چۆن دەزانێ ئەو میوانانە لەوێن ؟ بەڵام وەرامی خەجێ تا بڵێی ژیرانەیە بۆو کاتو دەمە لە شەڵتەی سەر گەرمە برین دەچێ !

« چ لاوی وەکی تۆ شیرنو شەکر تێدا نینە
خەمی خەجێ پێ ناچێ ! »

* *

قســـەکانی سیامەند لەورێنەوە نزیکن ، رەگەزی ئەفسانە سەر هەڵدەدا .. ســـیامەند دەستی ئاگاتە خەجێ .. خـەج ئەمی پێ قوتـار نابێ .. هەر هەودایەك دەیکرێتەوە ئەگەر بشـێ ناوی بنێین هەودای ئەوینێ . دەنا رێی نۆ شەوو رۆژان هەروا گەمەی پێ دەکرێ .. خۆین لەبـەر سیامەندی بڕواو نەمرێ . سیامەند ڕوو لە خەجێ دەکاو دەڵێ :

« هەرۆ کن دایکی من بنی کێلە شـێنێ
بۆم بێنە رســـتەی حەفت رەشماران
کـەزییـــەی حـــەوت کۆنـە یـاران »

ئەم ئەفســـانەیە هەشتی تەنیا لەبەر دڵی سیامەندی دەردەکەوێ دەنا خەجێ لای وایە رێی ماڵی بابی سیامەندی نۆ شەوو رۆژان تا دێتەوە سیامەند دەمرێ . بۆیە بە سیامەند دەڵێ باوەشم بۆ وەگرە با خۆت بۆ باوێم . سیامەند دەکەوێتە نزایان بەو مەرامەی تا خەجێ دێنەوە هیچی لێ نەیەو .. بکەوێتەوە سەر خاکو دەست بخاتەوە دەستی . ئەوەی جێی ســـەرنجە چۆن خـەج سیامەندی ئاوا بەجێ هێشتووە .. خۆ سووراو ســـوور دەزانێ نایبینێتەوە .. دەکرێ بڵێین سیامەند لـە نـاو ئازاری رێی دووری لێ نزیك بۆتەوە .. بەڵام خەج بۆ ؟ دەبێ خوێن گرتبێتی ؟

وەســـێت بە جێ‌هێنان لە ناو کورداندا پیرۆزەو ئەوانەی لـە گیانەڵاودان هەرچییـەك داوا بکەنو بکرێ بۆی دەکەن . خەج تێماوە ، دڵی سیامەندی پێ ناشکێ .. دەڕوا بۆ کێلە شینێ تا ڕســـتەی حەوت رەشماڵو کەزییەی حەوت کۆنە یاری بۆ بێنێ .. یان گولێ نام ـ نـاو گـول ـ ی دایکی سیامەند بۆی پەیدا کا . خەج دەگاتە بـەردەمی تـاولی گولێ نامێ ، دەبینێ گـولێ نـام کـولی هەستاوە :

« سیامەنێ من ! پایزە
عێلو زەوەندی تۆ هەموو
مایتەوە لە کیسانێ »

گولێ نام لـەبـەر خـۆ دواندنو مـەراقی سیامەندی ئاگای لەوە نیە خەجی بە سەرەوەیەو ناچار خەج دەڵێ :

« گولێ نامێ
سەری خۆ بنێ لە هەشێ لە هەشخانێ

**ئەدی ئەمن خەجم**
**هاتیمە بەر مارێ »**

لەوەی دەچێ گولێ نام زانیبێتی خەجو سیامەند پێکەوە ڕۆییون . خەج سیامەندی لەم کردووە .. جگە لە گولێ نام باسی کەسی دیکە نەکراوە .. ( بابو براو خوشك ... ) هەر سیامەندە ، سیامەندیش بۆ خاتری خەجێ هەموو شتێکی وەلا ناوە .. لە هەمووان بەنرختر گولێ نامە .. خەجێ تێ دەگەیێنێ .. دەستو برد گولێ نام داخوازی خەجێ بەجێ دێنێ . بەلآن پێی دەڵێ تۆ [illegible] نابەم . بەراست گولێ نام دوای ئەوەی [illegible] سیامەندی زانی چۆن دلی بەبەرەوە وەستاو لەپێش خەجێوە بەهەڵەداوان بۆ لای سیامەندی نەچێ . دەڵێ تامەڕو ماڵەکە تاقەت دەکەم تۆ بڕۆ ، بە دواتدا دێم ! دەبێ سیامەند دلی شکاندبێو گولێ نام ڕق ئەستوور بووبێ .. ئەم پرسیارانە بە ئاسانی وەرام نادرێنەوە .. یان باشتر وایە بڵێم بۆ من ساغ نەبۆنەتەوە .

* *

خەج دوای نۆ شەوو ڕۆژان دەگەڕێتەوە بۆ لای سیامەند ، سیامەند وەك کۆترێکی بریندار نووزەی دێ . بەیت بێژ لەسەر زمانی سیامەند کێشەی مردنو کۆتایی ژیان بە شێوەیەکی تابڵێی هونەرمەندانە دیاری دەکا . سیامەند دڵنیایە ئەو ڕستەو کەزیانە فوتاری ناکەن :

**« چەندت هێناون**
**سەد هێندەی دی بێنی**
**دەستم ناگاتێ »**

خەجێ دەیەوێ لە کۆتایی ژیانی سیامەندێ بگا ، خەج دەڵێ :

**« مادام گوریسو ڕستەکو کەزیت ناگەنێ**
**هەڵت کێشنەوە**
**ئامێزو باوەشی خۆ وەگرە**
**با منیش خۆ باوێمە خوارێ »**

خەجێ کۆمەڵە نزایەك دەکاو پاشان خۆ فڕێ دەدا :

**« ئەو پەل بڕێ لەسینگەو سەدەفی سیامەندی دەرکردییە**
**یارەبی بە بەینی هەر دوو مەمکێ منیش بکەوێ**
**ئەبێ هەر دوازدە ئەزیانم بێتە دەرێ »**

خەج خۆ فڕێ دەدا بە ڕێکەوت چۆنی دەویست وەها پەلی دارە بەنێ ئەوێ گرتەوە . تا هەر نەبێ بە مردوویی ببن بە لەشێك ، گیانێكو نموونەیان نەك هەر لە ئەدەبی ئێمەدا بەڵکو لە ئەدەبی ڕۆژهەڵاتدا کەمو دەگمەن بێ . مەرگەساتەکە بە مردوویش کۆڵیان لێ نادا . پەلی دارەبەنێ دەشکێتەوە .. جیا دەبنەوە .. بەیت بێژ زۆر زیرەکانە ویستوویەتی جارێکی کە ناوێتەی یەکتریان کا . وێنەیەکی « سێکس » بەشێوەیەکی ڕەزا سووك باڵێ نەرمی بەسەر کۆتایی بەیتەکەدا کێشاوە نیگارێکی ( مجسم ) مان دەداتێ .. هەر یەکێ لە ئێمە لە جێی خۆیەوە دەیبینێ .. سیامەند وەك ڕەمزی نێرینە دەبێتە سپی دارو بە بۆشایی چیای سپیانێدا هەڵ دەگەڕێ .. خەجیش وەك ڕەمزی مێیینە دەبێتە پەلکە مێوێکی سایە سووکو لەو سپی دارە دەئاڵێ .. لە پێنیسێ نەرمو هێشووە ترێ گەیوی دەگرێ .. تا وێکڕا ببنە دەرمانی ئەویندارانو ببنە ڕەمزی خۆشەویستییەکی نەمر لە ناو ئەدەبیاتی کوردانیدا . درودو ستایش بۆ بەیتەوانو دیاری دەنگی !

* * *

ئەو دێڕانەی لە کەوانەکاندان لە دەمی هونەرمەند حەسەن ڕەسووڵ سیساوەییەوە وەرگیراوە کە لە سەر شریت تۆمار کراوە . دیارە بۆ چوونەکانی ئێمەش دەربارەی بەیتی خەجو سیامەندە کە ناوبراو بەدەنگەوە وتوویەتی .

* *

چرکژن : دەنگی چەقۆ ، بە تایبەت کە بە بەری دەستیدا دەهێنن .

وەلانا وە : وازی لێ هێناوە . خستوویەتییە لاوە .

ئەنگوست : قامك ، پەنجە .
سبیانە : سبەینێ .
گەرووا : گەرووە شاخ . گەلی .
تێماوە : سەرسامە .
کەپو : لووت .

# تامبۆن

گورتە چیرۆک

وەرگێرانی : [illegible]

— ١ —

لە پڕ رووی خۆی لە ناو شووشەی سەر مێزەکەدا بەدی کرد . وەکو یەکەم جار بێت وەها بە راستی خۆی ببینێ ، بە سەرسامی یەوە روانی یە ئەو رووە گرژو مۆنو تاریکەی کە ئەگەر بیگوشیایە تەنیا ژەهری لێ ئەتکا ، ژەهرو هیچی تر . هەولی دا بەنیمچە پێکەنینێکی نیوە مردوو ، شەماڵێکی فێنک بەسەر چۆلستانی ئەو رووەدا هەلکات و کەمێک بیگەشێنێتەوە ، بەلام ئەوەندەی تر تێک ترشا ، بەجۆرێک گیانی پێ بدایە ئەبووە دڕندەیەکی فێ لێ هاتوو مێزەکەی شەق و پەق ئەکرد .

مەگەر هەر دلی رەش و گیانی ماراوی ، لەئاست گولی جوان و بەبەراما کوێرو لووت گیراو بێت !

ئەمەی بەسەردەمدا هات و نەی ئەزانی کەی و لە کوێ و لە کێوە ئەمەی بیستووە ! بەو نیازەی ئەو وێنەیە ون کات ، سەری هەلبری ، هاورێ دوژمنەکەی لەبەردەمیا وەستابوو ، هەستی کرد رووی رۆژی لێ گیراو سێبەرێکی تەلخ دای پۆشی . لەسەر مێزەکەش ئەو کتێبەی بە دیاری بۆ دانرابوو کە قەت بڕوای نەئەکرد رۆژێک لە رۆژان رووناکی ببینێ !

هەتا چەند رۆژێک لەوەوبەر کە باسی ئەوەی بەر گوێ بکەوتایە کالتەی پێ ئەهات .

بەپەشمەوە ئەیووت : قسەیە .. فشەیە با هەر لە ورگی خۆی بدات

لە دلی خۆشیدا ئەیووت : نایەتە دی ! بەلکە ئەمە خوایە بمرێ و ئەو ئامانجەی نەیەتە دی ! یا با من بمرم و ئەو رۆژە نەبینم !

بەراهاتنەوە دەستی درێژ کرد هەلی بگرێت و ئەم دیو ئەودیوی بکات و چاوێکی پیابخشێنێ :

بەلام وەکو دەستی بەر پشکۆیەک ئاگری دۆزەخ کەوتبێ خێرا کشانی یەوە . لەگەلیشیا چەناگەی شل بوو داکەوت ، لە لاشەیەک ئەچوو بە سێدارەدا شۆڕبوو بێتەوە !

لە ناکاو هەستا ، بەرەو دەرگاکە رۆشت و پەلاماری داو لە خۆیەوە دای خست . دووایی کردی یەوەو چووەبەر پەنجەرەکەو خستی یە سەر پشت . کەمێک سەیری دەرەوەی کردو بەرەو مێزەکەی گەرایەوە ، پێش ئەوەی بکاتە مێزەکە پری کرد بە پەرداخەکەداو پری کرد لەناوو نای بە دەمی یەوە ، تەنیا یەک قوومی لێ داو دای نایەوە !

لەبەرخۆشیەوە ئەیووت : نا .. راستە هەیە .. ئەلێن هەیە !

بەتوندی بەرەو مێزەکەی پێچی کردەوەو یەک دوو تەپلەک و کورسییەکی خست ، لەوە ئەچوو عارەبانەی غازبێت و وەرگەرابێت . کە لە سەر مێزەکەی دانیشت هەستی کرد هیلاکی یەکی بێ شومار ماسولکەکانی ئەهاڕێ و چاوەکانیش بچووک ئەبنەوەو پێلوەکانی بەسەریا ئەلکێن و ئەو جیهانە گەورەیەی لا ئەبێتە پەلەیەک ، نووقتەیەکی رەش !

جاران چاوی هەلئەگلۆفت هەر بۆ ئەوەی بلێن چاوی هیلاک بووی زانایەکە ، بەلام ئیستە بۆ یەکەم جار هەستی کرد هیلاکی دەروونی یەتی

چاوی ئەنووسێنێ : لە سەری هەلبری هاوڕێ دوژمنەکەی لەوێ نەمابوو .

بەترسەوە دەستی درێژ کردو کتێبەکەی گرت ، وەکو بێموەوە پشیلەیەکی تۆپیوی گرتبێ بێ‌ئەوەی سەیری بکا خێرا توڕی دایە چەکمەجەکەوەو دایخستو کلیلەکەشی لە قوولْو تاریکترین شوێنی جانتا گەورەکەیدا حەشاردا .

هەناسەیەکی قوولی هەلکێشاو وتی : ئا بەم جۆرە جوێنی ئەمانو مردنی بەسەردا نەدەم . بەلێ .. ئەم کتێبە نییە ! نەبووەو نابێ !

مۆمێکی تر دلی رەش رووناک کردەوە ! هەر ئەو ساتە بریاریدا بیر لەو کتێبە ئەناتەوە ! « مادام نییە ، نەبووەو نابێت ئیتر پێویست ناکا بیری لێبکەمەوە » .

ئەمەی وتو گیانی نەخۆش بە پەنجەی خۆهەلخەلەتاند ختووکەیەکی پێداهات ! مۆتەکەی سەر سنگی وازیهێناو بەجێی هێشت . لە ماوەیەکی کورتدا ئەم رایەی بەسەر خۆیدا سەپان . ئەوسا بریاریدا سەرێک لە [ محە ] بدات : بەدەم هەستانەوە ئەیووت : باسەرێک لەو تەمەلی تەوەزەلە بدەم بزانم چیئەکات ؟

ویستی بیر لە ( محە ) بکاتەوە ، کەمێك لەبەر دەرگای ژوورەکەیدا وەستا ، بەو بەرەوە لەسەر دارتووە چرەکە دوو چۆلەکەی نێر لەسەر چۆلەکەیەکی مێ ئەوە نەبوو بەدەنووك چاوی یەکتر هەلنەکۆلن. لە دووریشەوە حاجی فەراش ، لە بەردەمی ژوورەکەی [ محەدا ] لە سەر کورسییەکەی پان بووبۆوە !

هەولیدا دیسان بیر لە [ محە ] بکاتەوە ، بەلام خۆشی نەیزانی بۆچی کەوتە بیرکردنەوە لە چیرۆکی مام رێوی !

رێویی فێلباز مام شێری بەکوشت دا ، ئەچی خۆشی بە دەستی راوکەرێک کوژرا ، بێ ئەلێ ئەو راوکەرەش ، بە دەستی راوکەرێکیتر ناکوژرێت ؟ گوایە ئەم ئادەمیزادەی هەزار بەردی داوە بە پشتی ئیبلیسدا لەسەر پێتی رێویەک برایەکی خۆی ناکوژێت ؟ وەستاو ئاورێکی دایەوە ! لای سەیربوو بۆچی لەپڕ بیری لەم چیرۆکە کردەوە ! بۆچی وەستاو لەپڕ ئاوریدایەوە ! ئا .. ئاسانە .. پیاوی مەزنی لێهاتووە خاوەنی خووی سەیرە ! کە ئەمەی بەسەردا هات ، بزەیەک سەر لێوی گرت ،

ەوەی بە بیردا هات ، کە ئادەمیزاد هەتا بەرەوپێشەوە برواتو پێبکات خوورەوشتی ئەداتە دوواوە !

هەر لەم ماوە کورتەدا چەند شتی جووانی بەسەردا هات ، بزەکەی سەر لێوی کشاو گەشایەوە ، هەر ئەوە نەبوو دەستی ئافەرین ئەدا بەپشتی خۆیدا .

بەلام لەپڕ بیریکەوتەوە ، کە دوێنێ ، دوێنێ ئەم حەلانە فلان کەس ئەم جۆرە قسانە ئەکرد !

پێکەنینەکە لەسەر لێوی مرد ! گوریدایە خۆیو بەرەو ژووری [ محە ] رۆیشت ! کەوتە بیرکردنەوە لە [ محە ] ، وەکو بیەوێ داخی خۆی بەو بڕیژێت ، لەبەر خۆیەوە ئەیووت : پف .. تف .. هەزار تف .. هەی داوەشێتو کرمەرێز بی . تەمەل تەوەزەل ، بێکارە ، هەر پێنج شەش سال جارێ دەستی قەلەم ئەگرێت وا ئەزانێ ماری گرتووە ، چمکی لاپەرەیەک بە قەی قۆڕی رەشئەکاتەوە ! هەر مەشپرسە ، لە هەزار ئاوی داوە قوله پێی تەڕ نەبووە !

وا دیاربوو ، بۆ یەکەم جار ، شتێک بە دەما بێت . ئەختێک بە پێز بێت ، بۆیە خەرێک بوو بوەستێ هەتا بکەرێتەوەو خێرا بیانووسێتەوە ! بەلام وەکو یادی کتێبەکە بەندکراوەکە تازەو تەڕو بێ هاتبێتەوە بەرچاوی ، بریاریدا نەکەرێتەوە ! هێندەیتر گوری خواردەوەو خێراتربوو ، سەریدانەوان ، ئەیویست بفرێ .. لەداخا ، لەرقا .. بفرێ .

گەیشتە بەردەم ژوورەکە ، هەر بەو خێراییە پێمی کردەوە ، ئەیویست بلێ : سەرەرای هەموو شتێک ئەگەر مێشکێک هەبێت ئەوە ئەم مێشکەی منە ! هێشتا لە وشەی مێشکدا بوو کە قەوما !

هەستی تەنیا بە تەقەیەککرد ! ئەو تەقەیە هی چیبوو ، لەچی ئەکرد ئەوە بۆی روون نەبۆوە . هەر ئەوە بوو سەرو روویەکی تێترشاوی بەسەریەکا ترنجاو ئا .. ئا .. لەوانەی لە ئاوێنەی لە ئاوێنە ئەچوودا ئەبینرێن ، ئا .. لەوانەی گۆرەوی نایلۆن ئەکەنە سەریان سەرێکی نیو رووتاوی دی بە دەموچاوییەوە نووسا . هەر ئەوەندەی زانی بۆتە مریشکێکی ئاوە رووتکراو ، لە جیاتی ئەوەی پەرەکانی بکەون کەچی بەئاسمانا ئەفرنو مەلە ئەکەن . ئاسمانێک هەمووی بورکانەو بۆمبا یەک بە دووای یەکا ئەتەقێتەوەو جیهان وێرانو کاول ئەکا ، ئەوەندەی پێکرا بپرسێ : ئەمە چییە ؟ کەونە ؟

دۆزەخەن ؟ یان ....

— ٢ —

ورگە شـــــلەکەی وەکو مەمکی پیرێژنێک بەسەر کەمەریا شـــۆر بووبۆوە . دەستێکی برسی بەســـەر ورگیا هێناو وتی : بنووسم ؟ هە .. بۆ کێ بنووســـم ؟ ئەرێ کەی من ئەوەنـــدە کورتبینو گـــەوج بووم ؟ بیر لەم شتە بێبایەخە مەکەرەوە !

بیر لە شتێک بکەرەوە ســـــوودی هەبێ .. تامی هەبێ ، خۆشـــــی بەگیانو لەش بدات رووی‌کرایەوە ، کەشتیی بیرو هەستی رووی کـــردە رۆخێکی‌تر ! ئەمشـــەو ( خۆی ) بۆ ماڵی هاورێیـــەکی بانگ کردووە ! ئێ .. ئەمەیە شت .. ! باســـــی ئەمەم بۆ بکە ، هەر ئەمەو تەنیا ئەمە بیرکـــردنـــەوە ئـــەهێنێ .. هـــەزار نووسین ئەهێنێ ! خۆزگە ، کوبەی موســـــــل ، نا .. خوزگە کفتەی خۆمانیان ئەبوو ! هەســـــتاو نزیک پەنجەرەکە کەوتەوە ، لەو بەرەوە ، ئەو دوو چۆلەکەیەی بەدی‌کرد چۆن یەکتریان دائەپاچی !

ئا .. ! ئەمەم بەرێ ، تەنیا شت ئـــەوە بهێنێ پیاو خۆی لەپێناویـــــا بەخت بکا ئەمەیە ! خۆمان بە شـــت دائەنێین کەچی ئـــەبێ لەچۆلەکـــەوە فێر ببین ! گەڕایەوە شـــــوێنەکەی خۆی ، بە بێتاقەتی دانیشـــــــتو جگەرەیەکی داگیرسان . بە جۆرێک مژی لێئەدا وەکو لە دووکەڵەکەیدا دەرمانی سەرو دەروونە رووئاوەکەی تێدابێت . دووکەڵی جگەرە لـــەنـــاو تووکی لووتیا ون ئەبوو . مێشێکی چەقاوەسوو قارسی‌کرد ، وەکو ئەمە [ مچەی ] هێنابێتەوە یاد ، لەبـــەر خۆیەوە کەوتە بۆڵە بۆڵ .

**— ئەرێ ئـــەوە چیـیە ؟ ئـــەم زەلامە خۆی بەچی ئـــەزانێ ؟ بەخوا کەوجە وا ئەزانێ مەزنێتیو بلیمەتی لـــە دەیـــەنگیدایـــە ! گەورەیی لـــە زۆریدایە ! هەرچی زۆری نووســـی گەورەو بـــە بەهرەیە ! قسەی‌فۆر ! زۆربێو بۆربێ ! نا .. کوڕی باش کەم بێوپوختبێ ! وادیـــارە ئەمەی نەبیستووە ، یان بیستوویەتی بەڵام دڵنیام تێی نەگەیشـــــتووە ! ئەگەر وا بێ پیاوێکی زۆر گـــەوجو گەریش گەورەیە ! ها .. ! مەرج بێ ئەمـــە بکاتە پارچە یەک هۆنراوە . ئاخ .. ئەوەنـــدەی بیری تیژو بـــە بـــایـــەخ بەســـــــــەری ئەمدا دێت ، بەس داخی‌گران.. ئای خۆزگە ئەیخستنە ســـــەر کاغەز ! بەڵام کاتی نییە .. نەعلەت هەزار نەعلەت لە بێ‌کاتی !**

جارێکی‌تر هەســـــتایەوە ، لـــەوە ئەچوو تەنگەتـــاو بووبێت ! پارچـــە کاغەزە پرشو بڵاوەکانی ســـــــەر مێزەکـــەی کۆکـــردەوەو وتی : زۆر نووســــــین بەچی ئەچێت ئەگـــەر ئیبداعی تێدا نەبێت !

وازی لە پارچە کاغەزەکان هێناو بێخەمانە چاوی بڕی‌یە دیوارەکە ، ئەوەندە درێژەی کێشا ئەوە نەبوو دیوارەکە نەسمێت .

**— ئەو گەوجە نووســـینەکانی لەخۆی قەڵبترن . باشـــترە بیێتە راوچی ، راوە ماس بکات ، چونکە بە هەموو حاڵێک سەرئاو ئەکەوێت! ئەڕیش نابێت !**

ئەمـــەی وتو هم همێـــکی‌کردو رووی بە پەردەیەکی ســـــــەنگینی درۆزنانە داپۆش .

**— نـــاڵێم من زۆر ئەنووسم ، نـــا .. کـــەم .. ئێ ... زۆر کـــەم ئەنووسم . بەس ئەوانەی ئەیانوسم بەراســـــتی شـــــتن .. ئیبداعیان تێدایە !**

کە ئەمەی وت ، یەک دوو جار ئحم .. ئحمی‌کرد . هـــەرچـــەنـــد درۆی بکردایـــە وای‌ئـــەزانێ بـــەو ئحمانـــە درۆکان ئەسڕێتەوەو خۆی پاک ئەکاتەوەو وسڵ دەرئەکات .

سەری راوەشانو ئەمجارە نوچ نـــووچێـــــکی‌کـــــرد . دوو ددانی سەرەوەی لا راستی شــــــکابوون ، سەری زبانی وەکو سەری کیسەڵ ئەهاتە دەرێ[illegible] بیـــەوێ جرت لێبدا[illegible]لێیشیان ئەپرسی ئەو دوو ددانە بۆچی شکاون، هەموو جار شتێکی جیاوازی ئەگێرایەوە .

راستی‌یەکەش ئەوەبوو ، لە هەڵپەی خواردنا گۆشتی بـــە ئێســـــــقانەوە داکرماندبوو . راستی وتن لای ئەو بقە بوو . هەســـــتایەوە ، بێتاقەتی لەشی تەواو داهێزراندبوو . بـــەرەو دەرگاکە رۆی . بۆ کوێ ؟ خۆشـــــی نـــەی ئەزانی . هەربچێتە دەرێ ، ئیتر بۆ کـــوێ ئـــەڕوا بـــا بڕوات .

وەکو جاران با قاچی سەر قافڵەی بێت ! وەکو گوللە بەرەو دەرگـــاکـــە دەرپـــەری ، ئـــا لێـــرەدا لـــەوێش قەومـــا !

نەیزانی چی رووی دا ، تەنیـــــا هەستی بەوە کرد کراســـــــــێکی سوورمەیان لەبەر چاویـــا دانابێت ، هەزارەها ئەستێرەی ورد یاریان تیا ئەکرد ، روومەتو بەرسمێڵی تـــەڕ بـــووبـــوون ، تۆبڵێی لـــە مـــاڵی هاوڕێیەکەی بێتو شۆرباي کفتەی بەســـــــەرا رژابێت ، دەســـــتی بۆ روومەتی برد ، ئەوســـــــــا زانی فرمێسکەو بە ورژم بە روویا دێتـــە خوارێ !

— ٣ —

بەراستی ئەم خەڵکە ســـەیرە ،

له شتی وەها ئەپرسنەوەو بە دوایا ئەگەڕێن کە ناهێنێ ! دوو ئۆتۆمۆبیل یەکتری ئەشێلنو کەس ناپرسێ چی ڕوویداوە ، کــــەچی دوو زەلام تـامێــــۆن ئـەکـەن ، خەلکەکـــە ئەوروژێنن‌و ڕۆژی چەنــد جارێک سەری لێ ئەدەن‌و ئەبێ ســەرلەنوێ بۆیان بگێرێتەوە ! سەیرە ، مەگەر هەر خوانتەعالا خۆی بزانێ بۆ ئـــەم خەلکەی وا دروستکردووە !

حاجی [illegible] ئەوت‌و له دلیشیدا پێی خۆش بوو بـــسکەی ســــمێلی نەهات ، بۆ نا ، وا بوو بەشـــــــت ، جارهن کەس ئاوری لێ‌نەدایەوە کەچی ئەمڕۆ له هەموو لایەکەوە وائەبارن بەسەریاو چای بۆ بانگ ئەکەن‌و جگەرەی ئەدەنێ‌و بکرە بۆشی وائەگیرسێنن‌و ئەپرســــن : ئادەی حاجی .. بیگێــرەرەوە چۆن ڕوویدا .

— ئەرێ ئـــەم هەرایـــە لەپای چی ؟ بەراستی خوێندن پیاو ئەقـــل سووک ئەکا ! ئەمەی لەبەر خۆیەوە ئەوت‌و دوواییش لەدلەوە ئەیووت :

**— کاکە هــەر مەپرسە ! بڕوا بکەن ئەم دنیایەم لەم ســــەرێوە بۆ ئەو ســـــەری بڕیوە . بەس‌نی‌یە دووجار حەجم‌کردووە ! هەر مەلێن قەت شتی وەهام نەدیوە ، بەران ، ســابرین ، تا ، ئامێتش چ رایەیان ئەکەوێت شەرە قۆچی وەها بکەن . خاوەنی دوو مەحرەمەو شــەش بــە شەش تەلاق ئەخۆم هەتا باوکیشــم شتی وەهای نەدیوە . ڕووداوی وا ئەبێ پشتاوپشـــــت باس بکرێت‌و بگێرڕێتەوە !**

ئەمـــەی ئەوت‌و تفێکی قـــووت ئەداو خۆی ئامادە ئەکرد :

**— گوێ‌گرن چۆنم دی وەهــای ئەگێرمەوە ! مامۆســـــتا مچە لـــە ژوورەکەی خۆی هاتەدەرێ ، چاوم لێ‌بوو وەســــــتاو ئاورێکی دایەوە ، لەبەر خۆشی‌یەوە سەری ڕائەوەشان، لە دلی خۆما وتم : وادیارە خەریکی عیلمە . بۆچی نا ، تۆ بلێی لە مەلا شــــــرەکەی مزگـــەوتەکەمـــان کەمتر بێت ! ئەگینـــا تۆبەو هـــەزار تۆبــــە ئـــــەوە بـــەدەمما بێت کە .... ! وازبێنن ڕایەم ناکەوێ شــتی وەهـــا بلێیم دەی .. با تەواوی کـــەم .. ! وەکو تێسکەی تفەنگ بەرەو ڕوومان هات .مامۆستا مچەش وەکـــو بۆنی بـــریـــانی کـــــــردبێت ، ئـــەزانـــــن کەمێک نەوسنەو حەز لـــە خواردن ئەکات** .. ئەمەی ئەوت لەکەلیشیا لیوی خۆی ئەگەســـــــت وەکو کفری کردبێت‌و دەستیش بۆ ورگی ئەبردو لـــــە ژێر لێوەوە ئەیوت : **خوایــــــە لێم‌مەگرە ، دوو حەجـــم کـــردووەو حەز بە بوختان ناکەم !**

**— دەی .. بێنەوە سەرباسەکە ، لەپڕ لەژوورەکە هاتەدەرێ ، ئەگــــەر بلێیم تـــانجی بەخیلی پێ‌ئەبرد ڕەنگە بڕوام پێ‌نەکەن ! هەر کـــە ئەمـــەم دی ، زانیم کارەســـــاتێک خەریکە ڕوونەدات ، ویســـــــتم هەســـتم‌و ئاگـــاداریان بکەم ، بەلام هەتـــا من هەستام قەوماو دایان بەیەکا !**

لەســەر کورێ‌یەکەی هەســــــتاو ئەیویست بەدەســــــتی نەخشەیەک بکێشێ‌و ئەیوت : **قورئان بەهـــەقت بەجورێک بەیەکدا هەر مەپرســــــن‌و باسی مەکەن ! کورسی‌یەکەم نەگرتایە لـــە لەرزینا ئەکەوت . لەیەک دوو ژوورەوە خەلکی سەریان دەرهێناو وەیـــان زانی فرۆکـــە بـــە نزمی بـــە سەریانا فڕیوە . ئەگەر شــــــاخی گلەزەردەو ئەزمەر بیاندایە بەیـــەکـــا هەر ئەوەندە گرمەیان لێ‌هەلئەستا . هەردوکیان مامۆستا مچـــەو مچە . بۆ ماوەیەک وەســــــتان ، ئا واللە چەقین ، لە دوو پشیلەی توورەیان ئەکرد ، بـــە جورێک لـــە یەک مۆر ئەبوونەوە ئەترســـــام یەکتری بخۆن بەس بڕوا بکەن یەکتریان نەئەدی . نەک تەلاقی بەلکو هەزار تەلاق ئەخۆم یەکتریـــــان نەئەدی چونکە وەکـــــو تافگەکەی بێخال ئـــاو بـــەچاویـــانـــا ئەهـــاتـــە خـــوارێ ! کـــاکـــە هـــەر مەپرسە !**

— ٤ —

مچە بە ووڕی دانیشتبوو ، وەی ئەزانی سەری بۆتە میزەلان‌و ئـــەوە نی‌یە ئەفڕێت . ســەری بەهێواشــی ڕائــەوەشـــان‌و نووچە نووچی‌بوو . دەمار گرتبووی‌و ئەیووت :

**— خۆ سەریش ئەوەندە گەورە کردم ، ئەگینا کاژەلەی ســـــەرمی ووردوخاش ئەکرد ، مچ .. مچ .. ســـــــوبحانە اللە ، ئەوە چی‌بوو ؟ لە جیاتی عیلم ئەو ســــــەرە لـــە بەردوخشــــتو چیمەنتۆیە بۆیە وا ڕەق‌و قورس‌بوو ؟ من ئیتر لەمەوو دوواوە نانووسم ، توانای نووسینم نەماو گلەییشم لێ‌مەکەن !**

— ٥ —

مچەش لـــە ژوورەکـــەی خـــۆی لاجانەکانی توند ئەگوشی‌و ئەیووت :

**— ئەوە ســەرە .. ؟ جا ئەو کەی ســــەری هەبووە ، ئەوەندەی لەدەرەوە سافو لووســــە لەناوەوە ڕووتە ! نا ئەمە قەت ســـەر نی‌یە ، بەرداشەو تووکی لێ ڕوواوە ، هەر باش بوو سەرمی لەناو شـــــانما هەلنەتەکان ! دەی باشە دلی خـــۆی خۆش‌کات من لـــە ئەمڕۆ ئیبـــداعم نەما ، بەلی نەمـــاو حەیفو هـــەزار حـــەیف ! دەشی‌برد قـــەلـــەمەکـــەی هەلگرت‌و ئـــەم ڕستە بێ‌هاوتایـــەی نووسی !**

کورتە چیرۆك

# زەردە زیرە



کات بە پەلە و تیژ سەری خۆی هەڵدەگرت و توولە ڕێگا پێچا و پێچەکەی بەردەمی کەوەری دەپێچایەوە ، گەرمای نیوەڕۆ تەنگی پێ هەڵچنیبوو : [ دەی با ڕێگاکەی بەردەمم قەدبڕ کەم لەوێشەوە دیدەنیەکی سیروانی ئاوەڵیشم دەکەم ، بە ڕاستی ماوەیەکی زۆرە قاچ لەجێ چوونەکەی پەکی هات و چۆی خستوە ] .

دەیویست شان بە شانی تیژ تیپەڕبوونی کات گێژەڵووکە و ماوەکەی پێشی هەڵلووشێ ، لەو هات و بردەدا هەنگاوی گەورە و گورجی بەرەو پێش دەنا ، لە پڕ دەنگێ ڕایچڵەکان :

**ـ خاڵە .. خاڵە .**

گورج سەری بۆ لای دەنگەکە هەڵبڕی ، ڕوانی چەند منالێك ئەمبەر و ئەوبەری سەری ئەو کوڵانەیان گرتوە کە ئەم پیدا دەڕوات و سەرەتاتکێ لەگەڵ چەپکە تیشکێکی وەنەوشەیی دەکەن ئەو هەر بەرەو پێش دەڕۆیشت و بەرە بەرە لەوان نزیکتر دەبووە ، جارێکی کە دەنگەکەی بیتەوە :

**ـ خاڵە مەیە پێشەوە ، نزیك مەبەرەوە .**

کەمێك وەستا ، دەم و دوی وشە ئەرەخەوانیەکانی هەڵدەسەنگان ، چاوێکی بە چوار دەوری خۆیدا گێڕا ، هیچی نەبینی بە خۆیدا چووە ئاکامێکی نادیاری هەست پێ کرد

**ـ ( ئێ بابە ئەبێ چی ڕوویدا بێت ؟ ) .**

لای ئەو سەری گلۆلەیەکی ئاڵۆز بە ئاستەم دەبینرا :

**ـ ( تۆ بڵێی گاڵتەم پێ بکەن ؟ ).**

هەر خۆی وەڵامی خۆی دەدایەوە :

**ـ ( نەخێر لەوەش ناچێ کۆڵان چۆڵ و تەنیا هەر من و ئەوان دیارین ) .**

منالەکان هەر لە دوورەوە خەریکی هاوار کردن بوون :

**ـ بە کۆڵانی ئەو دیووا .**

ئەو هەر دەڕۆیشت ، خولیای ئاکامی ئەو سەمەرەیە کاسی کردبوو ، لەبەر خۆیەوە ورتە و بۆڵەی دەکرد :

**ـ ( کوڕینە ئەم بەزمەیان لەپای چی ؟ .. ) .**

ئەم کە دەڕۆیشت دەنگێکی لەناو ژاوەژاوێکی بێ سەرو بەرەدا دەبیست :

**ـ شارە زەردە زیرەیە .**

سەری هەڵبڕی ، بەم لاو ئەولای خۆیدا ڕوانی ، دەنگ و ڕەنگ لە خامۆشیەکی پڕ لە ئارامدا خۆی دەنواند ، هەر ئەوەندەی پێکرا بەردەوام بڕوات بیری لای ژاوە ژاوەکە بوو :

**عەبدوڵلا عەزیز خالید**

**– ( خۆ شـــارە زەردە زیرەی ورووژاو نابینم ، گاڵتەشـــم پێ ناکەن ) .**

بڕوای نـە دەکرد بـەو قرچەی گەرمایە و لەو خامۆشـیـەدا زەردە زیــرەکـان ب[illegible]تن و لای وابـوو هەرگیز ڕووداو[illegible]یرروو دووپات نابێتەوە !

ئەو هەر دەڕۆیشت و منالەکانیش هەر هاواریان دەکرد :

**– خالە مەیـمرە پێشێ ، وریای خۆت بە .**

لە جەنگاڵەی ئەو وەڵامدانەوەیەدا بوو ، لەگەڵ بیســتنی دەنگی گیزە گیز پێوەدانێکی کت و پڕ ســـزەی لە پەنا گوی هەڵسان و تەنیـا هـەر ئەوەندەی پێکرا بە لەپێ دەســتی زەردە زیرەکە بە پێســتی پـەنا گوێی‌وە پان بکاتەوە ، منالـەکانیش لەو لاوە :

**– ئـەرێ وەڵلا ســـزەی لێ‌هەڵسان .**

یەکێکی تریان :

**– تۆ بڵێی لەم زەردە زیرەهارە نەجاتمان بێت ؟**

ئەو لە شوێنی خۆی گرژبوو :

**– ( ئـەمـــە چی بـوو ، خـــۆ دووپشـــکەکەی پار هێندە ئازاری نەبوو ) .**

ئەو دوای پلیشـــانەوەی زەردە زیرە کە بە تووڕەییەوە بەرەو پێی تووڕی دا :

**– (ئەمەیە حوکمی مێژوو ) .**

منالەکـانیش دوای ئەوەی لـە ئاکـامی ژیـانی زەردە زیرە کـــە دڵنیابوو ، خیرا بـەرەو لای ئـەو بوونەوە لەم ســاتەدا دەنگ لە نـاو دەنگدا دەبسترا :

**– دەست خۆش .**

سێ دەنگی تێکەڵ بەیەك گـران جیادەکرانەوە :

**١ – ئەمە ئەنجامی هاریە .**

**٢ – خـــۆ ڕێگای بـــە هەمـــوو ڕێبوارێك دەگرت .**

**٣ – دیـــارە ئەویش وەك ریوەڵـە نەخۆشەکەی گەرەکی خۆمـان وایە چێژ لـە ئازاری خەڵـکی وەردەگرێت .**

منالەکان کە تەواو نزیك‌بوونەوە یەکێکیان هاتەپێشێ :

**– لەو شارە زەردە زیرەیە تەنیـا ئەمەیـان مابوو ، ئەوانی تریش بـە هەمان دەرد چوون .**

**یەکێکی تریان :**

**– هەراســـانی بـــە ئـارامی ڕێبوارەکان هەڵچنیی بوو .**

دوای هەڵوێســـتێکی کەم ئەو بەرەو ماڵی ســـیروان کشـــاو منالەکانیش بە ڕوویەکی گەشـــەوە مژدەی لـــە دایـك‌بـوونی زەردە . خەنەیەکی نوێیان بـە ڕووی ئاسماندا هەڵدەدا کـــە یەکێکی هـــەرە بـە تەمەنیان وتی :

**– دەی با ئێمەش بڕۆین بێ‌خەم دەست بەیاریەکەمان بکەینەوە .**



# دووی کەوتنەوە



سۆران مەحوی

دیت چاخانەکە جمەی دەهات ، چۆن خەلکەکە سەرقالی یاریکردن بوون ؟ تۆ تەنیا بە دیار ڕادیۆکەوە ، گوێت بۆ مووزیەکە شل‌کردبوو ..

مووزیەکە بەرنامەیەکی ئەدەبی دەخوێندەوە ، بەوەیا دلت دابوویە ، دیار بوو باسەکەت لاگرنگ بوو . لە پڕ جیرەی دەرگاکە ، لە بەرنامەکەی کردیت‌و ڕووی پێ وەرچەر خاندیتە لای'دەنگەکە . کاتێ هاتە ژوورەوە ، پەستی‌بە دایگرتیت ، بەر چاوت تاریك بوو .. ناچار چاخانەکەت بەجێ‌هێشت ، چوویتە دوکانەکەی ئەوبەرەوە ، تۆزێ وەستایت ، خەریك بوو لەوێش بڕۆیت .

هاتنی ئەو گلی دایتەوە ، بە بالآیا ... بە زولفەیا ... دواجار کولمە خرین‌و پڕی جەستەی سەرنجیی ڕاکێشایت . « ئای چ خەرمانێکە ؟! هەزاری وەك دەغەزارەکەت بە قووربان بێت..» .

قەدەرێ بە بەر لووتەوە وەستا ، وەخت بوو بسووتێی ! لە دلەوە دەتویست لە نهێنی‌یەکانی بگەیت ، کە چی هەر چەندت دەکرد ، زاتت نەبوو حالی بکەی .

لێت پارایەوە شتێکی پێ‌بدەی ، کەچی ئەوەندە ڕەحمت نەبوو ، نائومێد دلتاشکاند :ـ

— **بەو هەزاری‌بەش لە ئێمە دەوڵەمەندتری .**

★ **بەخیلیش بەم حالە دەبێت .**

کەوتیتەوە چنینی ئەونی قسەکانت ، هەرگیز بەلای مەبەستەکەی‌دا نەچوویت .. ئەنجام کرۆکی ڕازەکەت وا درکاند :ـ

— **خۆشم دەوێ‌ی !!**

بەلایەوە سەیربوو ، نەدیوو نەناس ، ئەم قسانەبکات ، تا ئێستا هیچ کەسێ وایی پێ‌نەوتووە . تەنانەت بۆیە نانی سوالی دەخوات ، تا ئەو جۆرە قسانە قوبوولّ نەکات : !

★ **خۆشت دەوێم ؟**

— **ئا ... زۆریش .**

قەدەرێکی‌تر لات گلی خواردەوە ، وەزعەکەی بەلاوە ئاسایی نەبوو ، کەوتە ئەوەی وتەکانت پێ‌ببڕێ :ـ

★ **چاکە ... بەلام .**

— **بەلام چی ؟!**

★ **هەژاری شیاوی بەزەیی‌یە ... نەك خۆشەویستی .**

ئەوەبوو ڕازەکەی پێ‌فرۆشێتەوە، کەچی تۆ وەك مێشیش میوانت نەبێ ، بەسەرخۆتا نەهێناو لە پەنا ئەوەش‌دا ، خەیالت چووە سەر ئەوەی چۆن بتوانی تاسەی ئەو خەمە ، کە لەلیابوو بووە ، گرێکی قولفەدراو بەرەوێنیتەوە :ـ

— **چی دەکەی ، بەشی تۆش ئەمەیە .**

سوێ‌ی نابووە هەناوتەوە ، تا دەچوو گەرای نازی لە دەروونتا دەرشت تۆش نیازت‌بوو ، هەر بەو ژان‌و ژێ‌یەوە ئازاری بدەی .. دوای هەناسەیەکی ئەفسووناوی ، زەردەخەنەیەکی سەیری سەر لێوەکانی خست :ـ

★ **ئێستا چیت دەوێ ؟!**

تۆزێ بۆی وەستایت .. بیرت لە ئاواتەکانت دەکردەوە ، دوایی پێت وت :ـ

— **دەمەوێ یارمەتیم بدەی .**

★ **یارمەتی !!**

— **بەلێ یارمەتی ... زۆر پێویستیم بە ....**

کەوتە گێژدانی وتەکانت .. هێنای بردی « ئەبێ پێویستی بە چ جۆرە یارمەتی‌یەك بێت ؟ ئایا ئەو یارمەتی‌یە لە توانای مندایە ؟ نەء ئەبێ مەبەستێکی خراپی بێ !! ...

ڕەنگە ئەم لێکدانەوەی من وا نەبێو ـە پێچـەوانـەوە دەربچن . بۆچی دەبێ ئێمە هەمیشـــە لە ژیاندا ، هەموو شـــــتەکان بـەخـــراپ کاری‌یەکانەوە شـەتەک بدەین ؟! و هەرگیـــز بـەدیوەکـەی‌کەی‌دا بۆی نەچیین ؟ » .

**★ با بیرێکی لێ‌بکەمەوە .**

بەناخی مەسەلەکەدا ڕۆچوو ، تا بگاتە سـەر ئەنجامێک [illegible] وونتر ..
**« ئاخ ... سـەد [illegible] یف بۆ لاویکی وەهـا قۆز ، لـە زەعیفەیە داوایی یارمەتی بکات !! بڕوا ناکەم ئەگەر نەگەیشـتبێتە تینی وەهـا بکووروزێتـەوە مـەرجـە ئـەگـەر چوونیشـــم لــە دواوەبێت ، چیم‌پێ‌بکرێ کۆمەکی بکەم ... »** .

**★ دان بەخۆتا بگرە .**

خـەیـــاڵ بردی‌یەوە بۆ گـــەلێ ڕووداو .. تا دەهـــات دیمەنەکەی لەبەرچاو ڕۆشناتر دەبۆوە .. و ئەو ئاواتانە هەیبوون چووزەرەی‌دەکرد .

**★ بەیانی ئەم کـاتـە بەبوونو نەبوون وەڵامت دەدەمەوە .**

عەباکەی لە خۆوە ئاڵاندو بـەرەو شەقامەکەی ئەودیوو ڕۆیشـــت .. تۆش ســـــەیرت‌کرد تا لە قورگی شـــــەقامەکەدا توایەوە . ئەو بەســـــەرهاتە هاژاندیتی لەناوەوە دەکوڵێت ، هۆشت بەخۆتەوە نەما ، وەك باڵندەیەکی نامۆ دەمێ سـەرەو ژوور ملت دەناو تاوێ بـەرەو خوار دەبوویتەوە ... نەخێر چوویتـەوە شوێنەکەی خۆتو راوخت دەکرد ، حەوایی بووبوویت ، ڕۆژی روونت لێ‌بووبووە شـــــەوە ژەنگ ، حـاڵـەکـەتـــان ! ... ژووری نووستنەکەت ! ... تەنانەت ئـەو شـــــوێنەی شـــەوان ، هیلاکی ڕۆژگارتی تیـا دەردەچوو ... بوو بووە دۆزەخو ئاگری وەجاخـەکـەی مام سالح .. ئێستا یان تۆزێکی کە بتسووتێنێت .

بـەتـــەواوی خـــەوت لێ‌زرا ، مشتومڕی ئەو ڕۆژەت هاتەوە یاد ، **« تۆش شۆخی .. خوا نانی سواڵی بەکـەس نـەدات ... مۆڵەت بگرە بەیانی ئەم حطـە .... ، .... »**

لە مێشکتا دڵۆپەی دەکرد .

(0) (0) (0)

شـــەبەقی بـــەر دوکانـەکەت گـرتـەوە .. بـە لـەش لـەوێـدا چەقی‌بووی ، بەڵام بە دڵ لای ئـەو بوویت . چاوت لە چاخانەکە ! .. سەری کۆڵانەکە ! .. ئەو بەر !.. سەرجەم شـەقامەکە نەئەتروکاند ، **« ئاخۆ کەی دەرەخستێت ؟ تۆ بڵێی وەڵامی چی‌بێت ؟ گـومـــانم لـــە بەڵێنەکـــەیەتی ... زۆر نیـــزیکە گـالتـەی پێ‌کـردبمو بیـەوێت پێم ڕابویرێ ... چونکە بۆ ؟! ناچێتە عەقڵەوە زەعیفەیە بەو کولەمەرگی‌یە بژی‌و لەوەی دەســـتی دەکەوێت بەشی منی لێ بدات .. نەء .. نەء ئەبێ ئەوانەش وانەبێ‌و ســـوزی بەزەیی‌و گیـانی خۆشەویستی لـــە هەموو ئەوانـەی من دەیڵێم زیاتـر چاوی‌پێ لە هەموو شـــــتەکان بنووقێنێت ... »** .

لـەو گێـــژاوەدا دەمـــردیتو دەژی‌یایتەوە ، تـا ئـەوەبوو بینیت خۆی بە چاخانەکەدا کـرد ، تۆزێ لەبەر وەجاخەکەوە وەســـــتا ، کەوەری بـە خەلکەکـەدا هـات . هەموو مێزەکان گەڕا ، بەتیرێ دوو نیشانی دەشکاند . بەلایە دەیویست تۆببینێتو بەسەرێکی کە نیـــازی دەست‌کەوتێکی باشتری دەکرد .

زۆرت بۆ هات. بە نەرمەکۆکەیەک خۆتت نیشــــان‌داو بۆ لای خۆتت بەکێش‌کرد ، دوا جار لەبەر دەمتـا ڕوا :ـ

**★ ها ... هاتوویت ؟**

**ـــ لە مێژەوەیە .**

لەوە زیاتـر نەدوا ، دەســـتی لەباخەڵی نـا ، پڕیاســـــکەیەکی بەدەستەوە هات . پڕیاســـــکەکە بـەقـەوارە گـەورەو بـە نـاوەخن بچوك‌بوو .

**★ تاســـیب بێ ، ئـەمـە ڕۆژانەت دەبێ .**

دوایی دەســـــتی بۆ چاخانەکە راکێشاو قـــــەکەی بەم وتـانـە قفڵ‌دا :ـ

**★ ئەگـەر لێـرەش نەبوویت ، دیمەنەکە لە مێشکتا خەستربۆوە ، بۆ زۆر دواوەی بردیتەوە ، بۆ ئەو سایی بیرەوەری‌یە شـــیرینەکانی لـەمــــەر ( دەروێش ئـەمینـی ) ڕەحمەتی .**

ئەو پیاوە ســـەخاوەتەی چۆن هەموو جارێ ، زیرەی لە دوکانداری هەڵئەستاندو دەخیلەی دەســـــت نووقاوێکی داغان‌دەکرد .

دوایش لەو دیوو پەردەوە ، کە دیققـەتیـان لێ‌دەگرت ، بێ ئەوەی ( مەنقرێ ) لایخات هەموو پارەکەی بەســـەر لێ قەوماوانی گەرەکەکەی‌دا دابەش دەکـرد ، **« ئێ‌ی بەرەحمەت چی .. خەم مەخۆ نەمردوویتو وە جاخت ڕوونـە .. ئەوەندە هەیـە تۆ پیاوێکی نوورانی‌و ئەو ئافرەتێکی دڵو دەروون ساف .. »** .

پڕیاســـکەکەی کردەوە ، کـەوتـە سەنگو بەردی ، ناوەخنەکەی :ـ

— خواردنەکە مسۆگەرە ...
چش بۆ سبەی شەو .

هەموو شەوێ لەسەر کیسەو باخەڵی زەعیفەکە ، سەرخۆش دەبوو .. بەو بەزمە سووكو ئاسان ، دەچووە دنیایی زەوقەوە .

(0) (0) (0)

بەیانی‌یەکیان هێشتا خوماری شەو بوویت .. لەگەڵیا کەوتیتە کێشمەکێشێکی سەیرەوە . وەك میرات گرێ بیت ، سەودایی زۆرو کەمیت دەبڕێ‌یەوە ..

— ڕۆژانەکە دەری ناهێنێت .

پاشان ترسی ئەوەت لێ‌نیشت ، داواکەت ڕەت‌بکاتەوەو قسەکەت سەرنەگرێ .. و کار بەجۆرێ بشکێتەوە ، ببێتە مایەی جیابوونەوەتان . تەنانەت هەموو ڕێبوارانی سەر شەقامەکە بەدەنگتانەوە بێن ...

کەچی بیرۆکەکەت پێچەوانە بۆوەو پتر بە دەووروپشتا هات :—

★ بۆچی تیای نابێت ؟!

نەخێر سکالای خۆتت بۆ کرد ، باری‌گوزەرانیت لا روون‌کردەوە ، لە تۆ زیاتر خەمی خوارد ، ئازارەکانی ناوێتەی ئازارەکانت بۆوە .

هەیتا هەیتا سوێی دەنایە دڵی‌یەوە :—

★ با بیرێکی‌کەی لێ‌بکەمەوە !!

بەکێك بە وەزعەکەی نەزانیبایە وا تێ‌دەگەیشت لە دێر زەمانەوە میرات‌گری ( شیرین‌و فەرهاد )ن .. یان سەرلەنوێ ( مەم‌و زین ) زیندوو بوونەتەوە .

« وا بڕوات دەبێتە هاوسەر ، خێزانێکی بەختیار دادەمەزرێنین . ئای چ کامەرانی‌یە خێزانی هەر لە سەرەتایەوە ، بەردی بیناغەی لەسەر ئاسوودەیی بەرزبێتەوە .. گەرچی ئەو ژیانەش لە سەرچاوەیەکی هەژاری‌یەوە هەڵقوڵابێت » .

(0) (0) (0)

بەتەواوەتی بوێتە پەروانەی ، وێنەی پیری موغان ، سەرمەستی مەیخانەی عەشقی جوانی بوویت . واتزانی بەوە ئیتر هەموو شتێ کۆتایی‌یە ... بۆیە جارێکیان پاش ئەوەی پریاسکەکەی خستەوە چنگت پێت وت :—

— زۆرم خۆش دەوێ‌ی !!

★ دەترسێم لە دڵەوە نەبێ‌و لەبنەوە بۆ هەریەکە بێت .

نەخێر خۆتت بۆ دابین نەکرا ، کەوتیتە برزکاندی قسەکانت ، بێ لێکدانەوە پشکۆی سوورەوە بووی داخوازی‌یەکەت نا بە جەرگی‌یەوە :—

— دەمەوێت بتخوازم .

کاتێ پەردە لە نێواندا دڕا ، ئاگری دەکردەوە ، چەشنی نیشەکەشێتە چوو بەئاسمانا ، ڕەنگ‌و روخساری شێوا « ئەمە هەموو مەبەستێکی بوو » . دڵ‌ساردی‌و بێ‌ئارامی‌یە ڕووی تێ‌کرد .. هەستی بریندار بوو . ڕووت لێ‌نایەوە :—

— عاجزی ؟!

★ چۆن عاجز نەبم !! شتەکان ڕووانەت دەرچوون .

— تێ‌ناگەم .

★ خەڵکی لە بەزەیی‌یەوە دەیان لاواندمەوە .. منیش بەو دڵەوە دەملاوانیتەوە .

— ئاخر ..

★ چۆن ..

— سەرچاوەی هەموو بەزەیی‌یە ، لە کانیاوی خۆشەویستی‌یەوە دەتەقێت .

پاش ئەو گلی‌یەیانە ، پشتی تێ‌کردیت ، ڕووەو ریزە دوکانەکە ڕۆیشت ... لەمەراقدا پشێت دەخواردەوە ... دان خەیاڵت بە مێشکدا دەهات . « تازە گوزەشتی‌کرد... » .

وەخت بوو ڕووەو شوێنێکی نادیار بڕوات ، قەد ئەوە ( بەسێ‌خان ) نەبوو ، بە هەڵەداوان هاتەوە ، ئەمەت بەلاوە سەیربوو . دیارە خەبەرێکی خۆشی پێ‌یە « زۆر نیزیکە دڵی هاتبێتەوە شوێنی خۆی » هێدی هێدی لێت نیزیك بۆوە ، وەك نەبای دیبێ‌و نەباران تێ‌هەڵچۆوە :—

★ بگرە ئەمە دوا دیاری‌یە ...و ئیتر بۆ جارێکی‌تر نەمبینیتەوە .

— چۆن ؟! ... بۆچی ؟! ...

★ خێڵ دەچێتەوە هەوار .

زمانی بەسترا ، یەك دوو دڵۆپ فرمێسك ڕژانە بینایی‌یەوە ، بەنازی دیدەکانی دۆعا خوازی یەکجارەکی لێ‌کردیت .. ئەو سەرەی دایخست تا دوورنەکەوتەوە هەڵی نەبڕی . تۆش ئەوەندەی‌کە حەپەسایت ، چاوەکانت لێ‌بڕی تا بزربوو ... ئیتر لەوەو دوا ، نەتزانی ئەو ئافرەتە شۆخ‌و سەخی‌یە ڕووەو کوێ ڕۆیشت ، یان ئێستا بەری بە چ شوێنێکەوەیە .

## ئۆپەریتی

# بووکە بەبارانێ

**پێشــــەکی :**

**ئەم ئۆپەرێتە بە مۆسیقاکەی مامۆســــــتا خالید سەرکارو ، دانانی جوولانەوەو ڕاهێنـــانی مامۆستا سەلاح ڕەئوف ، لە ١٩٧٦/١٢/٢٦ دا لە میهرەجانی سالانەی قوتابخانەکانی سلێمانی ، لە لایەن قوتابخانەی پیرە مێردو چیمەنو خەباتەوە بـــە هاوبەشیی لەســــەر شـــــانۆی چالاکی قوتابخانەکان ، پێشکەش کرا .**

**نووسینی ـ عومەری عەلی ئەمین**

لە ڕاستیدا ئۆپەرێتی بووکە بە بارانێ کـــە لە سالی ١٩٧٢ دا نووسیبووم ، تەنیا نیشاندانێکی فۆلکلۆری ئەو نەریتو باوەڕە کۆمەلایەتیانە بوو ، کـــە لـــە کوردەواریمانـــدا بۆ داخوازی بارانبارین بەڕێوە دەکرێن ، جگە لە ئەوەش بەرگێکی نیمچە میـــسالی لەبەردابوو هیچیش نەدەووت .

جا بە نیازی سوود وەرگرتنی شـــانۆ لـــە کەلەپووری نەتەوایەتیمانو ، ئالوگۆڕی کەلك لە نێوان کەلەپوورو شانۆدا ، هەولمدا کە ئۆپەرێتی بووکە بە بارانێ بە گیانێك موتوربە بکەم کە هێلە درامی یەکەی ئەو بەرگە میـــــسالی یەی لە خۆی دامـــالی بێتو وەك شانۆی یەکیش زمـــان بگــرێتو بتوانێت شت بلێت . بۆیە ســــەر لە نوێ لـــە تەموزی (١٩٨٠) دا نووسیمەوەو دەستکاریم کرد . بەتایبەتی زیادکردنی شەخســــیەتی کارێزکەند ، هەروەها بەشی دووەم ، جگە لە دەســــــتکاری هۆنراوەکانو گۆڕینی هێنـــدێك گفتوگـــۆ بــــە جموجوولی ئۆپرالی ... هتد کـــــە هیــوادارم نیازەکەشم بەشی خۆی هاتبێتەدی .

### لە ڕووی زمانەوە :

وشـــەیەکی تێدایـــە ، ڕوونکردنەوەی باری سەرەنجی خۆم بە پێویســـــت دەزانم ، ئەویش ئەوەیە :

زوربەی ئەو نووسینانەی کە خوێندوومنەوە لە جیاتی وشـەی ( هەنارانو مەناران ) وشــــەی ( هەلارانو مەلاران ) بەکاردەهێنن .

بەلای منەوە وشەی ( هەلار ) هەڵەیەو ، وشەی ( هەنار ) ڕاستە . من بیرم بێت منداڵان لە کۆندا هەر وشەی ( هەناران )یان بەکارهێناوە ، وە ئەم وشەی ( هەلاران )ە کە ئێستا منداڵ بە هەڵە بەکاری دەهێنن ، فۆلکلۆری نییەو دروستکراوەو ، لە ئەنجامی ئەو نووسینانەوە کەوتۆتە دەمیان .

لە شێوەی کوردی سۆرانیدا من ئەم بیستووە وشەی ( هەلار ) کە مانا بەخشێتو وشەی هەلاریشم نەبیستووە . بەڵام وشەی ( هەنار ) دیارە کە میوەیەکە . جاکە منداڵان لە بووکە بە بارانێدا بۆ بارانبارین دەپاڕێنەوە ، تکا لە خودا دەکەن کە بارانێکی ئەوەندە زۆریان بۆ بارێنێت ، دڵۆپەکانی بەقەدەر هەنارێك گەورەبێت ، یان دڵۆپەکانی ئەوەندە زۆرو جوانبن وەك دەنکە زۆرو جوانەکانی هەنار .

هەناران ـ بە قەدەر هەنار یان بە قەدەر زۆرو جوانیی دەنکەکانی ناو هەنار .

مەناران ـ لە زمانی کوردیدا وشەو جنس وشە بەکار دەهێنرێت وەك : کانیو مانی ، دەغڵو مەغڵ .

جا لێرەدا وشەی ( مەناران ) لە جنس وشەی هەنارانە ، واتە ، گەورە وەك هەنار . یان لە جنسی دەنکە هەنار واتە ، زۆرو جوان .

بووکە بە بارانێ لە ڕووی هونەریشەوە :

لەو باوەڕەدام کە ئەم ئۆپەرێتە لە باریش بێت بۆ ئەوەی کە دەقی هۆنراوەو گفتوگۆکانی واز لێبهێنرێتو تەنیا بە مۆسیقاو دەربڕینی سەماو تەکنیکی شانۆوە بە شێوەیەکی پانتۆمیمو ئۆپراڵی پێشکەش بکرێت .

* * *

## بەشی یەکەم

— ١ —

جێگا ـ گوڕەپانێکە ، سێ دەرگای ماڵانی لەسەرە ، هێندێك گژوگیاو ، گوڵو سەوزانیی لەبەر ماڵەکاندا سیسو زەردبوونو خەریکن وشكدەبن .

شانۆ ـ چۆڵە 
مۆسیقا
سەما .

سێ پیاو هەر یەکە بەرماڵێك ، یان بە شانەوە ، یان لە ملدا ، یان بە دەستەوەیە ، یەکێ تەزبیحێکی قەزوان ، یان دەنك ڕەشی گەورەیان بە دەستەوەیە ، دێن . بە دەستەسڕەکانیان ئارەقی ناوچاوانو ملیان وشكدەکەنەوە .. بە ئاسماندا هەڵدەڕوانن ، لە سەوزایە وشکەوەبوەکان ورددەبنەوەو بە چیچکانەوە لایانەوە دادەنیشن . بە بەزەییەوە دەستیان لێدەدەنو سەر هەڵدەبڕنەوە بۆ ئاسمانو سەیری سەوزایەکە دەکەنەوە ، لە ئاسمانو سەیری سەرێ ڕووەو ئاسمان دەست بەرز دەکەنەوەو لە ئاسمان دەپاڕێنەوە .....

کارێزکەندیش کە ماوەیەك دەبێت هاتووەو سەرەنجیان دەدات ، لە کۆتایی سەماکەیاندا ، ئەمیش بەسەما پێیان دەڵێت « ئەمە چەندان جار ئێوە چوونە نوێژەبارانە لەو دەشتە ، کەچی دڵۆپێك باران نەهاتە خوارەوە » پیاوەکانیش بەسەماوە خێسەی لێدەکەنو بایەخی پێنادەنو ڕووی لێوەردەگێڕنو هەریەکەیان لەدەرگایەکەوە دەچێتە ژوورەوە ، کارێزکەند بەتەنیا دەمێنێتەوە .......

— ٢ —

دەنگی تەپڵو دەف دێت بەرزبکرەوە ......
کارێزکەند لەلایەکەوە ڕادەوەستێت

چاوەڕوانی دەکات هەتا ئەو کەسانەی کـــە دێن سەرەنجیان‌بداو سەیریان بکات .

چەنـد کەســـــــێك بەدەم دەنگی تەپڵو دفـلێدانەو ، زیکری ( حی الله )وە دێن ، لەگەڵ ئەم گۆرانی‌یەی کۆرسدا ، سەمادەکەن :

**زەوی وشـــکو تینووە ، چاوڕێی باران ئەکا**
**مرۆڤ گشتی پەرێشان ، تەماشای ئاسمان ئەکا**
**گەر گوناهبارو ڕووزەردین ئێمە لە دیوانی تۆ**
**ئەگەر وێڵو شەرمەزارین ئێمە لە بارەگای تۆ**
**خۆ زەوی‌و [stain]ڵ بێ‌گوناهن بێ‌گومان**
**بمان بەخشـــە لەپاڵیانا خاوەنی هەورو باران**

ئەم کۆمەڵەش کە هاتوون ، یەکێکیان ڕووی خـــۆی ڕەش‌کـــردووەو ، کـلاوێـکی قــووچی لەسەردایەو ، تێلایەکی بەدەستەوەیە ، هەڵبەزو دابەزێکی سـەیر دەکات .

یەکێکی کە بە شیر هەڵسووڕاندنەوە حالی لێ‌هاتووە .

یەکێکی‌کە زەرگێکی‌داوە لە هەردوو گوێی‌و هەر ئەم سەرەوسەرێتی .

یەکێـکی‌کە هـەمـانـەیـەکی داوەبەکۆلیـاو زەخیرەی تێدایە .

ئەوانی‌کەش لەگەڵ ئەمانـدا تێکەڵبوونو ، هەموو زیکر دەکەن .

دەچنە بەر هەرماڵێك ، کابرای تێلابەدەست، بەهێز تێلایەك دەکێشێت بە دەرگاکەدا .

ژنی خاوەن ماڵیش لەدەرگاوە دەردەکەوێت قاپێکی بەدەستەوەیە ، وەك زەخیرەی تێدابێت ، وایە . دەی‌کاتە هەمانە هەمانەبەکۆڵەوە .

دووای ئەوەی کـــە هەرسێ ماڵەکە تەواو دەکـەن ، دەڕۆنو ون‌دەبن « گۆرانی‌یەکە تـەواو دەبێت » یەکێکیان نەبێت کـــە کارێزکەند قۆڵی گرتووەو نەی‌هێشتووە بڕواتو دەیەوێت قـسەی لەگەڵ بکات .

لەم کاتەشـــــدا ژنی ئاخرماڵ کە ڕووەو ڕۆیشتنی کۆمەڵەکە ســـەیری دەکرد ، هەردوو دەست بۆ ئاسمان هەڵدەبڕێتو دەپاڕێتەوە .

**ژن** – تو و گەورەیی خۆت خوایە !! تو و گەورەیی خۆت لـەم تەنگانـەیـە ڕزگارمان‌کەیتو ، دەروومان لێ‌بکەیتەوەو ، بارانێکی بەڕەحمەت بنێریتو تینوێتیمان بشـکێنیت . [ ئیتـر دەچێتەوە ژوورەوە ] .

**کارێزکەند** – بەو کەســـەی کە قۆڵی گرتبوو ، دەیەوێت بەســـەماوە تێ‌ی‌بگەیەنێت کـە : « ئەمە چەندان جار نیازتـــان گرتەوەو ، ئاهتان کردو ، ڕووی خۆتان ڕەش‌کردو ، بەماڵاندا دەروەزەتان‌کرد ، بەتکای ئـەوەی کە باران ببارێت ، کەچی سوودی نەبوو ، دڵۆپێکیش نەهاتە خوارەوە » .

**کابراش** – بێ‌ئەوەی بایەخ بەهەڵوێستەکەی بدات قۆڵی لێ‌ڕادەپـسـکێنێو لێش توورەدەبێتو دەڕوات .

**کارێزکەند** – بەداخەوە ڕووەو ڕۆیشـــــتنەکەی سـەیردەکاتو سەری لێ‌بادەدات .

## — ٣ —

**دەنگەدەنگی قەڵەبالغیەك دێت ، کـە لەنـاو ئەم دەنگانەدا ، دەنگی گاو ، مانگاو ، گوێرەکەشی تێدایە .**

**کارێزکەند** – لەلایەکەوە ڕادەوەستێت ، هەتا ئەو کەسانەی کە دێن ســــــەرەنجیان بداتو سەیریان بکات .

لە هەرسێ دەرگاکەوە ، هــەر دەرگایـەی ژنێك دێتە بەردەرگاو ، یەکی منداڵێکیشـــــیان لەگەڵە ، هەموو ڕووەو دەنگەکە سەیردەکەن .
چەند کەسێك دێن :

**یەکێك** – سەری شکاوە پێچاوێتی .

**یەکێك** – دەستی شکاوە بەپەڕۆیەك کردویەتیـە ملی .

**یەکێك** – قاچی پێچاوە دەشـــــەلێتو بـەدار دەڕوات .

**یەکێکیش** – ساغە . [ هەر یەکەش ســــەرو تێلایان بەدەستەوەیە ] .

**ژنێك** – ئـەی بەخێربێنـەوە !! بـەخێربێنـەوە کوڕگەل . گاگەلەکەتان لێ‌سەندنەوە ؟

**دەستشکاو** ــ خوشــــکم ئەوانە نەبوون بەوەی بتوانن گاگەلی ئێمە بفڕێنن .

**ساغ** ــ بـەڵام چیبێ لـەئێـــوە نهێنیبێـت ، ئەوانیش بەشی خۆیان دەستیان وەشاند .

**شەل** ــ برا . دەســتوەشاندن بەچیئەچێت ؟ خـۆ ئێمە لە ئەنجامـدا گاگەلەکــەمـــان لێسەندنەوە .

**سەرشکاو** ــ خوشکینە دلنیابن کارێکی وامـــان پێکردن ، هەقی ئەو ســــــاڵەشمان لێکردنەوە .

**شەل** ــ بەدەم ڕۆیشــــتنەوەو ، ئـەوانیکەش بەدووایدا ــ باوەڕبکەن ئەوان بەو زۆرییەوە، کەسیان بەساغی نەڕۆیشتوونەوە .

[ هەموو دەڕۆنو وون دەبن ]

**ژنێکیکە** ــ بەدەست بەرزکردنەوەوە بۆ ئاسمان ــ خوایە توو گەورەیی خۆت ئەم قوربانیانەمان بۆ بنووســــیتو بەزەبیت پیامانا بێتەوەو بارانێکی بەڕەحمەت بنێریت !!

**ژنێکیکە** ــ خوایە لەمەترسی گرانییو برســـێتیی ڕزگارمانکەیت !!

**ژنێکیکە** ــ خوایە لە مەترسی نەمــــانو فەوتـــان بمانپارێزیت !!

[ هەرسێ ژنەکەو منداڵەکان دەچنەوە ژوورەوە ]

**کاریزکەند** ــ ڕووەو ڕۆیشـــــــــتنی پیاوەکان سەیردەکاتو سەربادەدات ......

— ٤ —

**دەنگی پـۆلێـــك منـــداڵانی کـوڕو کـچ بەگۆرانییەوە :**

بووکـــە بەبـارانێ
ئـاوی بندەغـلانێ
ســـەعاتی جارانێ
هێ ...... ی !!!
هەنــارانو مەناران
یاخوا داکاتــە باران
بۆ نەقیرو هەژاران

**کاریزکەند** ــ لەلایەکەوە ڕادەوەستێت ، هەتا ئەو کەسانەی کە دێن ســــــەرەنجیان بداتو سەیریانبکات .

**منداڵەکان** ــ بە بووکە بەبارانێیەکەوە دێنو بەدەم گۆرانییەکەیانەوە سەما دەکەن :

هەنــارانو مەناران
یاخوا داکاتــە باران
بۆ نەقیرو هەژاران

[ دەگەنە ... مال ]

سەعاتی جارانێ )
ئاوی بندەغلانێ ) لەجارێك پتر دەووترێت .
بووکـە بەبارانێ )

[ دەرگا دەکرێتەوە .. ژنێك دەردەکەوێت ، جامێکی پێیە وەك ئـاوی تێدابێت وایــە ، منداڵێکی بچووکیش لـەگــەڵـــدایە ... ژنەکەش بەجامەکەی سەر دەســــــتیەوە ، بەدەم ئەم گۆرانییەوە ، بەسەما ، لـەنـاو منداڵەکاندا دەگەڕێت ] .

**ژن** ــ ئـەی منـاڵی هــەژاران
بووکتــــان هێنا بۆ بـاران
زویــــــــرە زاوا لێمـــــان
ڕۆیشــتووە بۆ ئاســــمان
تکات لێئـەکـەین بـەزدان
بــەزاوا بـدە فـەرمـــان
بێتــە خــوارێ بۆلامـــان
چاوەڕوانــە بووکی جـوان

[ جامە ئاوەکە دەکات بەسەر بووکەکەدا ]

**منداڵان** ــ هێ .......... ی !!!

[ لەم کاتەشدا منداڵی ژنەکـە دەچێتە نـاو منداڵەکانەوەو بەشداریان دەکات .

دایکەکە دەچێتەوە ژوورەوە
منداڵەکان بەدەم ڕۆیشتنەوە دەســــــتە

پێده‌که‌نه‌وه ] .

**مندالان** – هه‌نـاران و مه‌نـاران
یاخوا داکاتـه باران
بۆ فه‌قیرو هه‌ژاران
[ ده‌گه‌نه به‌رده‌رگای مالی ناوه‌راست ]

**مندالان** – بووکـه بـه‌بـارانێ
ئـاوی بن‌ده‌غـلانێ
سـه‌عاتی جـارانێ
(له‌جارێك پتر ده‌ووترێت .)

[ [illegible]ته‌وه ، پیـاوو ژنێك ده‌رده‌که‌ون پیـاوه‌که جامێـکی به‌ده‌ستـه‌وه‌یه ، وه‌ك ئاوی تێدابێت وایـه ؟.. ژنـه‌کـه له‌به‌ر ده‌رگـا راده‌وه‌ستـێت و پیـاوه‌که‌ش بـه جامه‌که‌وه ، به‌ده‌م ئه‌م گۆرانی‌یه‌وه بـه‌سـه‌ما بـه‌نـاو منـداله‌کاندا ده‌گه‌رێت ] .

**پیاو** – خوایـه هه‌رچیمان ئه‌که‌ین
له‌گرانی به‌دوورمان کـه‌ی
رووسوورو سه‌ربه‌رزمان که‌ی
فرزه‌ندیمان بـه‌تین کـه‌ی
گیـان‌له‌به‌ر تێرۆپرکـه‌ی
سه‌رزه‌مین ئاسووده‌که‌ی
دلی زاوا نـه‌رم کـه‌ی
به‌بووکه‌که‌ی شـادی‌که‌ی

[ جامه ئاوه‌که ده‌کات به‌سه‌ر بووکه‌که‌دا ]
**مندالان** – هێ .........ی !!!
[ پیاوو ژنه‌که له ده‌رگاکه‌وه ده‌چنه‌وه ژووره‌وه ]
[ مندالان به‌ده‌م رۆیشتنه‌وه ده‌ست پێده‌که‌نه‌وه ]

هه‌ناران و مه‌نـاران
یاخوا داکاتـه باران
بۆ فه‌قیرو هه‌ژاران
[ ده‌گه‌ن به‌رده‌رگای سێ‌یه‌م مال ]

**مندالان** – بووکـه بـه‌بـارانێ
ئـاوی بن‌ده‌غـلانێ
سـه‌عاتی جـارانێ
(له جارێك پتر ده‌ووترێت .)

[ ده‌رگـا ده‌کرێتـه‌وه ژنێـك ده‌رده‌که‌وێت جامێکی به‌ده‌سته‌وه‌یه ئاوی تێدابێت وایـه ، منداڵێـکی بچووکیش له‌گه‌لدایـه . منداله‌که لـه‌نـاو ده‌رگاکه‌دا راده‌وه‌ستێت ، ژنـه‌کـه‌ش به‌جامـه‌کـه‌ی سـه‌رده‌ستیه‌وه ، بـه‌ده‌م ئـه‌م گۆرانی‌یه‌وه ، به‌سـه‌ماوه ، به‌نـاو منداله‌کاندا ده‌گه‌رێت ] .

**ژن** – باران بووکت وه‌ستـاوه
جوان و شـۆخ و رازاوه
دۆستـان ده‌وریـان لێداوه
هـه‌مـوو ده‌م بـه‌تـکاوه
هه‌موو دل بـه‌هیـواوه
چـاوه‌روانـن بێـتزاوا
توخوا دلیـان مه‌شـکێنه
ئـاواتیـان به‌جێبێنـه

[ ژنه ، جامه ئاوه‌که ده‌کات به‌سه‌ر بووکه‌که‌دا ]
**مندالان** – هێ ........ی !!!
[ لـه‌م کاته‌دا منـدالی ژنه‌که ده‌چێته ناو منداله‌کانه‌وه‌و به‌شـدارییان ده‌کات . منداله‌کان به‌ده‌م رۆیشتنه‌وه ده‌سـت پێده‌که‌نه‌وه هه‌تا وون ده‌بن ] .

**مندالان** – هه‌نـاران و مه‌نـاران
یاخوا داکاتـه باران
بۆ فه‌قیرو هه‌ژاران
بووکـه بـه‌بـارانێ
ئـاوی بن‌ده‌غـلانێ
سـه‌عاتی جـارانێ

[ ژنی سـێ‌یه‌م مال له‌به‌رده‌رگاکـه وه‌ستاوه . کارێزئه‌ند که به‌درێژی ئه‌م بینراوه سـه‌رنجی منـاله‌کانی ئـه‌دا ، هـه‌ردووکیـان رووه‌و رۆیشتنی منداله‌کان سه‌یرده‌که‌ن ]

**کارێزئه‌ند ، به‌ژنه‌که** – ئه‌م په‌پوله پـاکانـه بـه‌م رۆژگاره خه‌ریکی بووکه به‌بارانێن... که‌چی ئاسـمان له‌راسـتی ئه‌وان وه‌ك ووشکی کردبێت ، وایه .

[ ژنەکە دەچێتەوە ژوورەوە .
کارێزکەند هەر ڕووەو ڕۆیشـــــــتنی
منداڵەکان سەیردەکاتو سەربانەدات ].

ـــ تـاریکی ـــ

## بەشی دووەم

— ١ —

**هەر هەمان جێگایە ، دووای دوو مانگێك ڕووناکیەکی کز**

**کۆمەڵێك ژنو پیاو لەو کەسـانەی کـە لەبینراوەکانی پێشوودا بەشدار بوون .**

**پیاوێك** ـ هەرچیەکمان کرد سوودی نەبوو .

**ژنێك** ـ بەڵێ هەرچیەکمان کرد سوودی نەبوو ،
یەك دڵۆپ باران نەهاتە خوارەوە .

**پیاوێك** ـ دەغڵو شیناییو باخو بێستانی ئـەم
ســـــالمان هـەمووی لـەتینوانا خنکاو
ووشكبوو !

**ژنێك** ـ ووڵات بۆکرۆزی لێهەڵدەستێت !

**پیاوێك** ـ حاڵ وابڕواتو ئەگەر ئاسمان فریامان
نەکەوێت ، ســالآنی داهاتوو ووڵات کوێـر
دەبێتەوە

**کارێزکەند** ـ ئاسمان ؟ ئاســـــمان فریای ئـەو
کەسانە ناکەوێت کـە پالیان لێدابێتەوە .

ئەوانەی کـــە پالی لێئەدەنــەوە ، ئـەبێ
پیشەیان هەر ئەوە بێت بە دەسەوسانیەوە
بەئاسماندا هەڵڕوانن ... ئاسمان فریـای
ئەو کەســـــانە دەکەوێتو یاریدەی ئـەو
کەسانە دەدات ، کە خۆیان فریای خۆیـان
بکەونو یاریدەی خۆیان بدەن .

هەموو لەبەر خۆیانەوە ـ کە خۆیان یاریدەی
خۆیان بدەن .

**کارێزکەند** ـ بەڵێ ... ئاسمان پێمان ئەڵێت :

من ئاوی باران لە سکی خۆمدا گل نادەمەوە ،
بەڵکو لەژێر زەویدا بۆتان عــەمـار دەکەمو
خۆتان ، دەیان کارێزی هەمیشــــــــەیی
لێبدەنو دەری بهێنن .

**پیاوێك** ـ ئەم کارە کارێکی گرانە .

**ژنێك** ـ گرانو قورسە .

**پیاوێك** ـ قورسو سەختە .

**پیاوێك** ـ سەختەو لەووزەدا نییە .

**کارێزکەند** ـ بەڵام ئـا[illegible] بەولاوە ،
ڕێکەیەکەیکە هەیە بۆ [illegible]و پەیداکردن لـەم
ناوچەیەی ئێمەدا ؟

[ هەموو بۆ ماوەیەك بێدەنگ دەبن ]

**کارێزکەند** ـ دە ئەم ڕێکەیە هەتا لەوەش سەختتر
بێت کە ئێوە دەڵێن ، .. بەڵام ئەنجامەکەی
سەرفرازییە .

**ژنێك** ـ قسە هەزارەو دووانی بەکـارە . کاکی
کارێزکەنـد پێکاوێتیو تەواو ، .... یـان
دانیشــــــتنو لـەتینـوا خنـکانو ووڵات
کوێربوونەوە ، یان بـەدەیان کـارێزلێدانو
هاژەی ئاوو ، ئاوەدانیو سەرفرازی .

هەموو بـەیـەك دەنگ ـ دەیـــان کارێــز
لێدان ... ! هاژەی ئاو ... ! سەرفرازیی ...!

**کارێزکەند** ـ کـەوابوو قوربانی کوێرم ڕۆژێـکەو
ئەمڕۆ .. با بەهەموو ... بـە جەماوەریی
شانی بدەینەبەر . شان ! شان ! شان !

[ هەمـوو بـەیـەك دەنگ لـەگـــەڵ
کارێزکەندا بەدەم خۆڕێکخستنەوە بۆ
ســەمایەك ، وشەی ( شان ) دەڵێنو
دەڵێنـەوەو بـەدەم ئـەم گۆرانییەی
کۆرسەوە سەما دەکەن ] .

**دایوەشــێنن دایوەشــێنن**
**پاچەکـانتـان داوەشــــێنن**

**لە خاکی ووشك لـە خۆڵەمێش**
**کارێــزی گـەش هەڵقـوڵێنن**

تویشووی ئەم ڕەنجە پیرۆزە
وورەی پەرزو کۆڵنەدان بێ

بەهێز لێیدەن بەتین لێیدەن
مێشکی بەردی سەخت بپژێنن

هەر هەڵکەن هەر هەڵکەن
نەسرەوتیی با دروشم بێ

لە قوولایی زەوی ڕەقدا
شوورەی عەماراو بشکێنن

جەماوەریی جەماوەریی
[illegible]شانو بازووتان بێ

بە ئاوی زوڵاڵی کارێز
ڕووی وولاتان بنەخشێنن

[ لەگەڵ سەماکەدا بەرەبەرە ڕووناکی بەهێزتر دەبێت ] .

— تاریکی —

## بەشی سێیەم

— ١ —

**جێگا** — وەك سەرخەرمانێك بێت لە باخێکدا . دەنگی خوێندنی هەمەجۆر مەلو ئاژەڵ .

**کات** — بەیانییە . ڕۆژهەڵهاتووە .
جووتیارێك بەدەم ئەم گۆرانییەوە شەن دەکات .

**سەما**

ئاوی کارێز ژیانە
گیانی باخو بێستانە
چاکەی کارو فرمانە
پێی بەخشین ئەم خەرمانە

دوو هەژار بەگۆرانیو سەماوە دێن .

خەرمان بەرەکەت | چەند جارێك
خەرمان بەرەکەت | دەووترێت .

**جووتیار** — بەدەم ئەم گۆرانییەو ، سەماوە ، وەك لەخەرمانەکە گەنم بکاتە توورەکەی هەژارەکانەوە ، بەشیاندەداتو هەژارەکان دڕۆن .

**جووتیار** — خێرو بەرەکەت | چەند جارێك
خێرو بەرەکەت | دەووترێت .

[ جووتیارەکە ، دووای ڕۆیشتنی هەژارەکان بە گۆرانییەکەیەوە ، دەست دەکاتەوە بەسەما ]
ئاوی کارێز ژیانە
گیانی باخو بێستانە
چاکەی کارو فرمانە
پێی بەخشین ئەم خەمانە
[ پۆلێك منداڵ بەدەم ئەم گۆرانییەی کۆرسەوە دێنو بەدەوری خەرمانەکەدا لەگەڵ جووتیارەکەدا هەتا کۆتایی بینراوەکە سەما دەکەن ]

**منداڵان** — چەند جوانە ئەم خەرمانە
گەنم مایەی ژیانە
خەندەی لێوی کارێزە
سوپاس بۆ ڕەنجی شانە

**جووتیار** — گەنم واتە هەرزانیی
**منداڵان** — هەرزانیی هەر هەرزانیی
**جووتیار** — واتە خۆشگوزەرانیی
**منداڵان** — بەڵێ خۆشگوزەرانیی
**جووتیار** — ژیانی کامەرانیی
**منداڵان** — ئا بەڵێ کامەرانیی
**جووتیار** — ئاسوودەو شادمانیی
**منداڵان** — ئاسوودەو شادمانیی
**جووتیار** — وولاتی ئاوەدانیی
**منداڵان** — بەڵێ هەر ئاوەدانیی
**جووتیار** — خۆشیو سەماو گۆرانی
**منداڵان** — خۆشیو سەماو گۆرانی



# گفت وگۆیەکی ویژەیی لەگەڵ مامۆستا خالید دلێری شاعیردا

ئامادە کردنی :
لەتیف هەڵمەت

**پ١ : ئەدەبی کوردی بەگشتی لەچاو ئەدەبی جیهانیدا لەچ ئاستێکدایە ( بە تایبەتی شیعر ) ؟**

و١ : یەکێک لەکەم و کووڕی یە هەرە گەورەکانی ئەدیبی کورد یا بلێین زوربەی ئەدیبی کورد ئەمرۆ ئەوەیە کەزمانی بێگانە نازانێت ... بەتایبەتی زمانی گەلانی لە ئەدەبدا پێشکەوتوو ... ئەوگەلانەی کارە ئەدەبی یە گرنگەکان بە زمانیان نووسراوە ... بۆیە خودی دەقی بەرهەمە ئەدەبی یەکانی جیهان ناخوێنێتەوە ... !

باوردتر سەرنج بدەین و حیسابێکی گیرفانی ئەدەبی خۆمان بکەین چەند شاعیری ناودارمان ... چەند چیرۆکنووسی چاکمان ... چەند پەخشان نووس و بەند ساغ کەرەوەی چاکمان .. چەند رەخنەگری بنیاتنەری ئاراستەکەرمان ئەو ئەدیبانەی جێ پەنجەی کاریگەریان لە ئەدەبەکەماندا دیارە .. یەکێک لەوزمانە گرنگانەی جیهان دەزانێت و ئەدەبی راستەو خۆی ئەو زمانە دەخوێنێتەوە ... ؟ ئەوانە نەبێ کە خوێندنی ئەدەبی یان لە دەرەوەی عێراقدا تەواوکردووە ... لەبەر ئەوە ئەتوانم بڵێم : ئەدیبی کورد بە شێوەیەکی گشتی ئاگایەکی ئەوتۆی لە ئەدەبی جیهانی ئەمرۆ نیە .. بۆیە هەرکار تێکردنێکی ئەو ئەدەبە بیکاتە سەر ئەدەبەکەمان کارتێکردنێکی راستەو خۆنیەو ئەو بەرهەمە جیهانیانەی وەردەگێڕدرێنە سەر زمانەکەمان ... مادام زمانێکی تر دەکەوێتە بەینمانەوە هەمو کەڵکی خۆی و هەموو ناوەڕۆکە رەسەنەکەی بەئێمە ناگات ... جگە لەوە ئەوەش کەوەری دەگرین گەلێ جار ناوەڕۆکە باش و قووڵ و بەکەڵکەکەنیە ... بەڵکو رواڵەت و بۆیاغ و توێڵەکەیەنی ...

خۆ کارتێکردنی ئەدەبەکەی ئێمە لە ئەدەبی جیهان ئەمە هەر زۆر کەمترو ناکاریگەرترە ...

بەڵام ئاستی ئەدەبەکەمان نزیکترە لە ئاستی ئەدەبی جیهان تانزیکی هەر لانێکی ژیانمان لە هەمان لانی ژیانی ئەم جیهانە ... لەناو ئەم تایبەتییەشدا ... تایبەتییەکی تر هەیە ئەویش شیعری کوردی یە کە دەتوانم بڵێم نزیکترین بەرهەمی کوردە لە بەرهەمی جیهان و بەمەزەندەی من ئەمە لەبەر دوو هۆ :

یەکەمیان ... ئەوەیە کە ئەدەبەکەمان بەگشتی بەتایبەتی شیعری کوردی رەسەنەو هەموو هێزو گوڕو کەرەستەی پێشکەوتن و گەشە کردنی راستەقینە لە تواناو هەوڵی شاعیران و جەماوەری شیعر دۆستی کوردو سروشتی کوردستانەوە وەردەگرێت تالەهەر شتێکی تر ... رەگی وەها قووڵ و بڵاو لەناو دڵی کوردا رۆیوە کە گەیشتۆتە پلەیەکی وەها بەتایبەتی لەپاش ئەم دە پانزە ساڵەی دوایی خێرایی یەکی سنوور دیاری بەخۆیەوە گرتووەو گەردە لوولی رۆژگار ناتوانێ زۆر لەو خێرایی یەی کەم کاتەوە ...

دووەمیان ... ئەوەیە کە ئەوگەلە پێشکەوتووانە لەم رۆژگارە ئەو گرنگی یەی بە بەشەکانی تری ئەدەبەکەیانی دەدەن بە شیعری نادەن ... جاروبار بەرێکەوت چاوم بەشیعری ئینگلیزی بەزمانی ئینگلیزی ئەکەوێ ... لەمەوە ئەم باری سەرنجەم لەلا دروست بووە ...

**پ٢ : ئەگەر رەخنەگرێ ڕاتان دەربارەی شیعرەکانی ـ خالید دلێر ـ چی دەبێ ... ؟**

و : شیعرەکانی خالید دلێر ـ بەلای منەوە ـ ئەم خاسیەتانەی خوارەوەیان تێدایە ... کە نالێم

ئەمانە تەنیا تایبەتین بە شیعرەکانی ئەوەوە ... هەر خاسیەتە کەم یازۆر لە شیعری شاعیرەکانی تریشدا هەن ... بەڵام هەموو خاسیەتەکان بە کۆمەڵ وەك لە شیعرەکانی ئەمدا کۆ بوونەتەوە لەهی شاعیرەکانی تردا کۆبەبوونەتەوە ... جا من لە خوارەوە دەیانخەمە بەرچاوی خوێندەوارانەوە .. چونکە بڕیاری ئەوان خۆیان چ بەتاکو چ بە کۆمەڵ نرخی راستەقینەی «شیعرەکانی» دلێر دەردەخەن لە گەڵ رەچاوکردنی کات‌و شوێندا .. لەپێش ئەوەی بچمە سەر باس‌کردنی خاسیەتەکان با بیری خوێنەران بهێنمەوە کە لەزووەوە وتراوە :ـ کەس [illegible] خۆی نالێ ترشە لەوانەیە ئەم قسەیەی پێشینان منیش بکرێتەوە ... !!

**١ ـ شیعرەکان بەیەك شێوە زمانی تایبەتی نەنووسراون ... بە کوردی‌یەکی تێکەڵ لە زۆربەی شێوە کوردی‌یە جیاجیاکان نووسراون ...**

**٢ ـ لە گەڵ ئەوەشدا کە شیعرەکانی دلێر تازەن ... واتە شیعری سەربەستی زۆرەو لەپاییزی سالی ـ ١٩٥٩ ـ وە ئەم جۆرە شیعرەی بلاوکردۆتەوە ... بەڵام هەرچۆنێ بێت شیعری کلاسی بەسەردا زاڵە ...**

**٣ ـ بەشوێن دروستکردنی وێنەو تابلۆی تواندا ناگەڕێ کە بەشیعر دروستیان بکات‌و زۆر بۆ ئەم مەبەستە خۆی ماندوو ناکات ... ئەمەش زۆربەی لەوەوە هاتووە کە شیعر بەلای ئەوەوە چەکی خەباتەو چەك گرنگنیە جوان بێ گرنگ ئەوەیە کاریگەر بێت ... شیعر بەلای دلێرەوە لە پێش ئەوەی تابلۆیێ بیرو باوەڕو باری سەرنج‌و ئامانج‌و هەڵوێستە ... ئەم راستی‌یە ئامەودایەکی باش دلێر لە ریزی شاعیرە کلاسی‌یەکان دوور دەخاتەوە ...**

**٤ ـ شیعرەکانی لەریزی هەرە پێشەوەی نیشتمانپەروەری‌و شۆڕشگێری بەزەقی تێدا دیارە ...**

**٥ ـ لەشیعرەکانی‌دا گەلێك لە کەلەپووری خۆمانە ( وەك قسەی پێشینان‌و ... هتد )و هی گەلانی تریش وەردەگرێت ... بەلایەوە وایە کە ئەمانە مەبەست‌و ئەنجام چاك دەدەن بەدەستەوە ...**

**٦ ـ ڕەمزی تەم‌و مژو مەبەست شاردنەوە لە تۆی گەڵا سلق‌و قاپیلکە پیازو باینجاندا بەکار ناهێنێت ... بەلای ئەمەوە شیعر یاپراخ‌لێنان نیە کە بەبێ پێچانەوە نەکرێت ... ئەگەر شیعر بۆ کۆمەڵانی خەڵك بنووسرێت نابێ شاردراوەبێ ... دەنا ئەو مەبەستەی کەبۆی دانراوە نایەتەدی ... یادرەنگتر دێتەدی ..**

**٧ ـ شیعرەکانی بەپێزن‌و شتیان زۆر تێدایە ... بە تایبەتی پشت بەزانین‌و فەلسەفەی زانستی دەبەستێت بۆ پاڵپشتی کردنی بۆچوونەکانی خۆی ... ئەم راستی‌یە لە شیعرەکانی دلێردا زۆر ئاشکراو روونترە تالە شیعری بلاوکراوەی شاعیرەکانی تردا ... بۆیەش یەکێ لە رەخنەگرەکان دلێری بەو شاعیرە داناوە کە دەرگایەکی تازەی بەرەو رووی شیعری کوردی کردۆتەوە کە ئەویش دەروازەی فەلسەفەی زانستی‌یە[١] جا لە گەڵ ئەوەشدا کە شیعرەکانی تائەو رادەیە دەرفەت هەبێ ... روون‌و ئاشکرا دەنووسێ ... لەبەر ئەم هۆیە هەندێ لە خەڵك هەر بەسانایی تێی ناگەن ...**

**جا لەم وەرامەدا ئەگەر لانی چاکی‌و باشم لە شیعرەکانی دلێردا زاڵ کردبێ بەسەر لانی کەم‌و کووڕی لاوازی یاندا ... ئەوا لەپێشەوە پاکانەم بۆ خۆم کرد ... لەدوای ئەم وەرامەدا ئەم قسەیەی پێشینان دەهێنمەوە کە وتوویانە :ـ ئەگەر کچ بەپێی مەدحی دایکی بێ خاڵ بۆ خۆی دەیخوازێ !!**

**پ٣ : راتان‌چیە دەربارەی شیعری کوردی بە شێوەیەکی گشتی .. چ شیعری کۆن‌و چ شیعری نوێ ... ؟**

و٣ : شیعری کوردیش وەکو کورد خۆی .. قارەمانە ... نەبەزە ... خۆگرە ... هیوای ژیان‌و وزەی تێکۆشان‌و تاسەی دلداری تێدایە بە تایبەتی ئەو بەشە شیعرە ڕیالیزمەی کە ئاوێنەی ژیانی ئەوچینە نیشکەرانەیە ... لە هەموو سەختی‌و تەنگانەیەکدا خۆی دەپێچێتەوەو ئەو لایەن و ئەندامانەی لەش کەسەرما بردەڵەو لاوازن‌و بەرەو گەردە لوولەکە دەکەون ... خرو

(١) رۆژنامەی العراق سالی ١٩٧٩ کەمال غەمبار ...

ترمۆلەیان دەکاتەوەو دایان دەپۆشێتو خـۆی کۆدەکاتەوە بـۆ تۆستنەوەی هـەر هـەلێکی بووژانەوەو خۆکردنەوەو گەشەکردنو پێشکەوتن کە لە ئەنجامی باری خودی خۆیو دەورو پشت ( الظرف الذاتی‌و الموضوعی )دا دەرەخسێتە ...

بەلگەم لەسەر ئەم راستی‌یانەی سەرەوە زۆرە ... لێرەدا بەتایبەتی تەنیا یەك بەلگەیان دەلێمەوە کەزۆر سادەو ئاشکرایەو لە بەرچاوی هەموومانە ئەویش ئەوەیە کە ئەدەبی کوردی بەگشتی‌و شیعری کوردی بەتایبەتی لە گەل ئەوەشدا ئەو هەموو بارە نالەبارانەی بەسەردا تێدەپەرێ ... هەرماوەو سەربەرزەو ورەی زۆران کردنو تێکۆشانی بەرنەداوە .. کە ئەم راستی‌یەش زۆربەی بەری درەختی رەسەنایەتی ئەدەب‌و شیعری کوردی‌و باری خودی خۆیەتی ( الظرف الذاتی ) تائەوەی هی هیچ شتێکی تر بێت ... ئەم باری خودی خۆیی‌یە گەلێ لەبارەکانی دەوروپشت بە هێزتر بوون کە جاروبار بەرێکەوت بۆی هەلکەوتوەو تاوێ لەژێر سایەی‌دا حەساوەتەوە پشتێکی بۆ بەرز کردۆتەوە ..

ئەم رەسەنایەتی‌یەی شیعری کوردی لەپێش هەمو شتێکی تر هـۆ بووە بۆمانو جاروبار بووژانەوەی خۆی‌و ئەدەبی کوردی بەگشتی ...

ئەم دوو سێ پەرێگرافەی سەرەوە زۆر پێویست بو بنووسرێتو خوێندەوار بیزانێت ... لە سەرێکەوە وەك راستی‌یەکی پرشانازی‌و دلخۆشکەر ... لەسەرێکی ترەوە وەك رێ خۆشکەرەوەیەك بۆ وەرامدانەوەی پرسیارێکی تر لە پرسیارەکان ...

شیعری کوردی ماوەیەکە لە قاوغە تەسك‌و ترووسکەکەی جارانی هاتۆتە دەرەوەو پەروبالەکانی لێك داوەو توولتر بۆتەوەو لە بارەی زۆر لانی تری ژیانو مەبەستو ئامانجی نەتەوەیی‌و چینایەتی‌و مرۆڤایەتی ئەدوێ‌و دەنگی هەلدەبرێ‌و رێباز دەس نیشان دەکاو دەرمان بۆ هەندێ دەردان دیاری دەکاتو هەستی بەپەیامە پیرۆزەکەی کردووە کە لەسەر شانیەتی لە خزمەتکردنی گەلو نیشتمانو مرۆڤایەتی‌دا ...

ئەمە لەبارەی شیعری کوردی‌یەوە بەگشتی ... بەلام لەبارەی دووجۆرەکەی شیعری کوردی ( شیعری کۆنو شیعری تازە ) ئەگەر مەبەست لەپرسیارەکەتان روونکردنەوەیان بێت ئەوا دەلێم :ـ

شیعری‌کۆن ... شیعری کاریگەرو خاوەن تاقیکردنەوەو جێگای دیاری خۆیەتی لەناو هەستو مێشکی گەلەکەماندا ...

هەندێکیان ئەوانەی هەر لەسەرەتادا وزەو پێزێکی ئەوتۆیان نیە پییان لەسەر لێواری گۆرە .. شیعری کۆن ئەگەر بشلێ [redacted] پیرە ( واتە پیر بووە ) لە هەمان‌کاتی [redacted] لێم پیری لەش‌و تەد لەگەل پیری ئەمیان پیری‌یەکی نەمرە ...

دەلێ پیرو خێر پێوە نەماو کە شاعیرەکەی‌و تویەتی :

**تراژا بەندی سوخمەی نالی گولناری**
**بە ئاهی من**
**کەچی دەستی لەسەر داناً لەسەیری**
**باخ‌و بەی گردین ... !!**

شیعری کۆن خاوەنی رەنگ‌و رووو بەژن‌و بالاو ئادگارو بۆن‌و تام‌و چێژی تایبەتی خۆیەتی کە بەم شتە تایبەتی‌یانە لە چیرۆك ... پەند ...

پەندو پەخشانو ... شیعری نوێ جیا کراوەتەوە هەر بەمانەش دەوری گرنگ‌و مێژووی خۆی دیوەو تا ئێستاش درێژە بەدیتنی پاشماوەی ئەو دەورەداوە ... لەگەل ئەوەشدا کە دەربرینی هەستو باری سەرنجی ئەم سەردەمە وەك ئەوەی کە پێویستەو تا ئەورادەیەی کە پێویستە بەم شێوە شیعرو پاراستنی هەموو مەرج‌و کۆت‌و پێوەندەکانی کارێکی گرانە ... بەلام ئەگەر شاعیر زانیاری باش‌و زۆرو سەرنجی قوول‌و وردی هەبێت‌و زمان زانی چاك بێت‌و تاقیکردنەوەی باشی لەگەل شیعر نوسیندا هەبێت ... سەر بەکۆسپ‌و تەگەرەکانی ئەوشێوە شیعرە دائەنوێنێت‌و ئەگەر جاروبار سەرکەشییەکی کرد ملی‌پێ‌کەچ دەکاو بە ئارەزووی خۆی‌و هەرچۆنێکی بوێ وەها دادەرێژێت ...

لێرەدا نابێ وتنی ئەوەمان لەبیر بچێ کە لەبەر ئەوەی شیعری بەشێوە کۆن مەرج‌و

پێویستیو ئەرکی گرانی هەیە ... دارشتنی پێویستی بە توانایەکی زۆرو پوخت هەیەو هەموو کۆلکە شاعیرێك یاتازە شاعیرێك ناتوانێ قەرەی لە قەرەی بداتو لە دەستەو یەخە بوونیدا خۆی بۆ راگیر ناکرێو شیعرەکە دەیدات بەزەوی‌دا ...

بە حوکمی عادەتو لێراهاتنو گوێ خۆشیی ... تا ماوەیەکی دوورو درێژی تریش جەماوەر بە هۆگری ئەم جۆرە هۆنراوەیە دەمێنێتەوەو پارێزگاری لێدەکاتو لە باوەشی خۆی دەگرێت ... بەلام هەرچۆنێ بێ بە شێوەیەکی [illegible] جۆرە شیعرە یان شیعر بەم شێوەیە هەتا [illegible] جیهانو ژیان بەرەو پێشکەوتن برواتو زانیاریو تەکنیکی هەمە جۆرە بلاو ببێتەوە هەستی خەلك بەرەو ناسك تریو وردتری برِوات ... شەپۆلی شیعری کۆن بەرەو سەرچاوەکەی دەکشێتەوە ... شیعرە زۆر گرنگو قوولەکانی ئەم جۆرە شیعرە نەبێت ئەوانی تر پەردەی لە بیرچوونەوەیان بەسەردا دێت ...

شیعری نوێ زادەی ئەم سەردەمەو شیعری دەربرینی هەستو نەستی نیوەی دووەمی چەرخی بیستەمی ناسراو بەسەردەمی زانستیو تەکنیکو قوولبوونەوەو خەرەوان بوونەوەو گەشەکردنی هەموو لایەنێکی ژیانی مرۆڤو خێراییو گورجو گۆلی‌یە ... ژیان سەختبووە ... ئالۆزبووەو پانیو بەرینیو بەرزاییو قوولی لە سنووری جاراندا نەماوە ... خەلك هۆشیار بونەتەوەو دۆستو دوژمنو چاکەو خراپە ناسراون ... لەمەش زیاتر هەریەکێك لەمانە کراون بەچەند جۆرو توێکلو هەریەکە لە ریزێك بەپێی کاتو شوێن دانراونو جێ گۆرکێیان پێ دەکرێ ...

جا دەربرینی هەستو مەبەستو بیرو باوەرو زانیاری ئەم سەردەمەو چۆنیەتی گۆرانە جۆر بەجۆرو خێراکانو هەلوێست بەرامبەریان بەتایبەتی ئەگەر لەو دەربرینەدا حیسابێکیشی بۆ گۆرانەکانی دوا رۆژتێدا بکرێ .. ئەم دەربرینو دارشتنەو وردو ناسکو قوولانە بە شاعیری زۆر بە تواناو قوولو دەست رۆیشتوو نەبێت بەشیعری لە شێوەی کۆنی خاوەنی کۆتی قافیەو زنجیری کێشو گوریسی وشەی قەبەو مۆسیقای تایبەتی دانارێژرێت ...

لە بەر ئەوە شیعری نوێ شیعری ئازاد بووە - ئارادەیەك - لەو کۆتو زنجیرو گوریسانە ... جۆری ژیانەکە وادەخوازێ کە شاعیر لەدانانیدا ئەوەندەی بە شوێن راستیو تەواویی دەربرینی مەبەستو هەستی‌دا دەگەرێ ... ئەوەندە بەشوێنی کێشو سەرواو ... دائەگەرێت ... شێوەی تازە دەبێ هەر ئەو شیعرەی خۆمان بێت

بە هەموو کەرەستەکانیەوە تەنها هەندێ کۆتو زنجیری لەقاچو دەستو قوفلی لەدەم بکرێتەوە ... بۆ ئەوەی بتوانێ بەپێی ئەم سەردەمە قسەبکاتو مەسەلە گرنگەکانو بۆ چوونەکان لە جاران رووتر بکاتەوەو کەلکی ئەم قۆناغەو دوا رۆژێکی نزیکی هەبێت ... پاش ماوەیەك ئەو بوێژە لاوانە گەرانەوە سەر رچەرەسەنەکەی وێژەی کوردی کە بەپێی یاسایەکی سروشتی گشتی هاتووەو بریتی‌یە لەم راستی‌یە کە هەموو شتێکی تازە دەبێ لە شتێکی لە خۆی کۆنتر ببێو لەناو رەحمی ئەودا دروست ببێو بێتە دەرەوە .. من ئەم راستی‌یەم لەم کۆپلەیە شیعرەدا دارشتووە :

**هەتابێ لەدوو دەستم**
**ئەمن تازە پەرستم**
**ئەوەشم هەر لەبیرە**
**نەمامی تازە رواو**
**کورپەی دارێکی پیرە ... !!**

کەدەوترێ شیعری نوێ ... مانای ئەوەنیە هیچ دابو دەستوورو مەرجێکی نی‌یەو لە هەرچی رێكو پێکی - نظام -یە بەدوورە .. نەخێر شیعری نوێش یاساو نەرێتو جۆرە مەرجو خاسیەتی خۆی هەیە ... ئەم خاسیەتانە ئەگەر لە دانانی شیعردا لەبەر چاو نەبێو پارێزراری‌یان لێ نەکرێ ... ئەوا ئەوشتە نووسراوە لە شیعر دەردەچێو دەبێتە قسەی ئاسایی یان جۆرێکی دواکەوتوو لە پەخشان ...

چۆن مەرجو دەستوورە قورسو گرانەکانی شیعری کۆن لە سەرەتای پەیدا بوونیاندا زەوقو سەلیقەی خەلك وەهای دەویست کە دەبوو دەستیان پێوە بگیرێتو لەبەرچاوبنو ئێستاش وادێ ببن بەکۆتو زنجیرو رێ لەپێشکەوتنی شیعرن بگرنو تادێت گرنگیان کەم دەبێتەوە ..

هەروەهاش دەستوورەکانی شیعری تازە ( بیرو باوەڕی پێشکەوتنخوازی‌و ئامانجی راست‌و گونجاوو سەرنجی وردو قووڵ کە بەشیعری شێوەی کۆن ئەتوانرێ دابڕێژرێت ... و بوون‌و پاراستنی مۆسیقایەکی خۆش‌و ناسك لە شیعرداو تارادەیەکیش بوونی جۆرە کێشێکی هاوبەش لە نێوان دێڕەکانی داو نەخستنە پشت گوێی سەرواش ئەگەر لەخۆیەوە بێت‌و ماناو مەبەستی شیعرەکەی نەگۆڕی ... ) دەڵێم ئەم دەستوورانەش ئێستا دەبێ بەچاکی بپارێزێن‌و رەفتاریان پێ بکرێت ... ئەمە هەرچەندە لە دوا رۆژدا ئەم دەستوورو مەرجانەش دەبنە رێگرو کۆسپ لەسەر رێگەی پێشکەوتنی شیعری ئەو سەردەمەو دەبێ لا ببرێن‌و دەستوورو مەرجی تر کە ئەو قۆناغە دەستنیشانیان دەکات دێنە کایەوە ...

شیعری تازە لایەنگرەکانی بیانەوێ‌و نەیانەوێ ... کوڕی شیعری کۆنە ... دەبێ هەندێ لە شێوەو ئادگاری لەو بچێت‌و هەندێ خاسیەت‌و مەرجی ئەوی تێدا بێت ... دەنا بەزۆڵ‌و بیژی لەقەڵەم دەدرێ‌و جەماوەری کوردستان بەشیعری خۆیانی نازانن ...

لە باس‌کردنی شیعری تازەدا ... باس نەکردنی روانگە ( مەبەستم ئەوکۆمەڵە ئەدیبەو نیمچە ئەدیبەیە کە خۆیان بە خاوەنی رێبازێکی ئەدەبی داهێنەری تازە ئەدایە قەڵەم‌و لەمانگی حوزەیرانی ساڵی - ١٩٧٠ -دا بەکۆمەڵ لەژێر ناوێکی ئاوادا بەیانێکیان لە بارەی ئەدەبەوە بڵاو کردەوە ... )

تەنانەت باس کردنێکی زۆر کورتیش بێت بۆ خۆم بەهەل لە کیس دانی دەزانم ... ئەمە جگە لەهۆی گشتیش کە حەز بەروو نکردنەوەی دەکەم ... لەوانەیە منیش لەبارەی ئەوکۆمەڵە لاوەوە هەندێ شتێبزانم ( وەکو کۆمەڵ باسیان دەکەم نەك وەکو تاك )کە رەنگە تائێستا کەس روونی نەکردبێتەوەو بێ‌گومان خۆشیان ئەمەیان گوتووە ... منیش تائێستا دەرخەتێکی وەك ئەمەم بۆ هەڵنەکەوتووە کە ئەم خاڵ‌و راستی‌یانەی تێدا بەخوێنەران رابگەیەنم ... بەتایبەتی ئیتر دواخستن بۆ ماوەیەکی تریش هەڵناگرێ ... پێشەکی داوای لێ‌بوردن لە خوێنەری بەرێزو لەو کەسانە دەکەم کە پرسیارەکەیان ئاراستە کردووم ... ئەگەر لە سنووری پرسیارەکەدا کەمێك چوونە دەرەوە هەبێت ... ئاشکرایە بڵاوکراوەکەی روانگەیی‌یەکان کوت‌و پڕ بەدروشمێکی سەرنج راکێشەرەوە ( وشەی نوێ ... بیری نوێ ... کرداری نوێ ... رەنگە لە مەیاندا مەبەستیان نوێ بووبێ ) لە لاپەڕەی رۆژنامەی هاوکاری‌یەوە بڵاو کرایەوە ... بەبێ ئەوەی لەوەبەر باسێك یا پێویستی‌یەك لەئارادا هەبێت کە ئەو کۆمەڵە ئەدیبە یەك بگرن ... بە تایبەتی کە بیرو باوەڕو ئایدیۆجیەتیان یەك نەبێت ... دروست بوونی یەکێتی نووسەرانی کورد[illegible] لە ناوەڕاستی مانگی شوباتی ساڵی - ١٩٧٠ - ماوەی ئیش کردنی یاسایی پێ‌درا ... واتە پێش بەیاننامەکەی (١١/ی ئازار)کە ئەمە باشترین هەلێك بوو تا ئەوڕۆژە دەست ئەدیبی کورد کەوتبێ ... بۆ ئەوەی زۆرترین ژمارەیان لەناو ئەو یەکیەتی‌یەدا یەك بگرن ... ئەمە ماوەی بۆ هیچ پێویستییەکی تری یەکگرتنی ئەدیبان نەهێشتەوە ... بەتایبەتی کە یەکیەتی‌یەکە تازە پێك هاتبوو پاش پێك هاتنی یەکێتی نووسەران‌و ئیجازە پێ درانی ... بەیاننامەی ئازاری بەسەردا هات‌و پەلەکرا لە بڕیار دان بۆ گرتنی یەکەم کۆنگرەی یەکێتی‌یەکەو رۆژی (١٩٧٠/٥/٧)ی بۆ دەست نیشان کرا [ وەك لە بیرمان بێت ] .

جا ئەو کۆمەڵە ئەدیبە لاوە یەکیان گرت تاکو لە کاتی بەستنی کۆنگرەکەدا کەڵکی لێ وەربگرن‌و دەنگیان هەڵبڕن‌و هەوڵدانیان کاریگەربێ‌و لیستەی تایبەتی ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری گشتی خۆیان هەبێت ... چونکە بەتاکە تاکە خۆیان بەبێ هێز دەزانی بەرامبەر بە ئەدیب‌و شاعیرە ناودارەکان ... من لەم مەبەستەیان گلەیی لێ ناکەم ... یەك گرتن بۆ مەبەستێکی وەها هیچ جێگەی رەخنە لێ‌گرتن‌و توانج تێ گرتن نیە ... بەڵام نەدەبو ئەوان باری کڵۆڵی وێژەی ئەوکاتەی کورد بقۆزنەوەو کەڵك لە کەمی‌ی رۆشنبیری وێژەی خەڵك وەربگرن بۆ زیاتر سەر لێ‌شێواندنیان‌و گومڕاکردنیان ... باری وێژەیی لەکوردستاندا هەر لەپاش ساڵی - ١٩٥٨ -وە بەرەو کپی‌و کەم بەرهەمی‌ی ملی‌نا ... ماوەی دوانزە ساڵ درێژەی کێشا ... لەو

ماوەیەدا سالی وابوە تاکە هۆنراوەیەك یا تاکــە چیرۆکێك چیە تێیدا بلاو نەکراوەتەوەو بەدەست جەماوەر نەگەیشتووە ... ئەو منالانەی لەسالی ١٩٥٨دا تەمەنیان چوارپێنج سالبووە ... لــە سالی ١٩٧٠دا بوو بوون بەلاو ... ئەم تامەزرۆو برسییانەی ئەدەبی کوردی لەتەمەنی خۆیاندا شتی وەها پڕ لــە قسەی زلو قەبەو نواندنی جۆشو خرۆشو دەربڕینی دلسۆزییەکی بێ سنووری بەرامبەر بە ئەدەبی کوردی وەك بەیانەکەی ئەمانیان کــەم دیبوو ... یان هــەر نەدیبوو ... بۆیە تارادەیەك بەرەو پیریەوە چوونو پشــتگریان لێ کرد ... ئەما[illegible] بەرەو پیرەوە چوونــەیان لەلا خۆش بووەو هــەر وەك بلێی مەســتی سەرکەوتن هــەلی گرتبوون درێژەیان بەقسەی قەبە داو تاوایان لێ هــات کەوتنە بلاوکردنەوەی شتی وەها کە هەرگیز لە گەل زانستدا ناگونجێت ... ئەدەبی کوردی لەپێش دروست بوونی روانگە چی نووسرابو ... چی وترابو ... هــەموویان ئەدایەوە بەدەمو چاوی کورداو بەشتی بێ کەلکیان دەژمارد ... بە پێچەوانەی ئەو راستییەی کــە لەسەرەوە روونم کردەوە کە دەبێ بەرهەمی تازەی وێژەی کوردیو هی هەموو گەلێکی تر لەبەرهەمی کۆن ببێتو لەودا سەر هەلبدا ...

( وشــــەی نوێ ) ... ( بیری نوێ ) ...

( کرداری نوێ ) ئەوەندە شتی بەرواڵەت خۆشن کێ هەیە دلی پێیــان نەکرێتەوە .. ؟ بەتایبەتی جەماوەرێکی وەها بێ بەشو تینووی ئەدەب ... بەلام ئایا ئەو هەموو ( نوێ )یە کوتو پڕ دەست دەکەوێ ؟!

وشە هەر وشەکوردییەکانی خۆمانە کــە هــــەمانەو بەسەرلێوی شــــوانو گاوانو بێریو کاسبکارو خوێندەوارانەوەن ...

بیریش هەر ئەو بیرو باوەڕانەیە کــە لەناو کۆمەلە هــەمە چینەکەماندا هــەیەو هــەریەکەیان ئاوێنەی ژیانی ئابووری چینێكو چینە دۆستەکانیەتی ... شــــیعرو بەرهەمی ئەدەبیش دەبێ هەر لەو بیرو باوەڕانەوە هەلقولێت و بە وشــە کوردییەکانی خۆمان دابڕێژرێت ... کــەواتە وشــــەی نوێی چیو بیری نوێی چی ... ! کەئەمانە نەبوون بەرهەمو شیعری نوێی چی ؟!

تا ئێستاش هەندێ لە لاوەکانمان لە ئەنجامی ئەو هاژو هووژەی ئەوان بەناوی نوێ خوازیو تازە خوازییەوە بلاویان کردەوە هەروا دەزانن کــە شیعری نوێ روانگەیییەکان دایان هێناوە ... !!

شیعری نوێ لــە ئەدەبی کوردیدا بــەو شێوەیەی ئەمڕۆ دەیبینین ـ تەمو مژەکەی نەبێ کەبەم خەستییەی ئەمڕۆ نەبو ـ چارەکە سەدەیەك بــەر لــە یەككرتنەکەی کۆمەلەکەی روانگــەو بلاوکردنەوەی بەیاننامەکەیانە ... بووبی خۆی بۆ خەلك دەرخستوەو جارێکی تریش بــە بەرگێکی تازە ترو وەك شاسوارێکی قۆزتر لــە جــاران هاتۆتە کایەوەو داهێنانی روانگەیییەکان نیە ... ئەم لایەنە پێویستی بەروونکردنەوەی زیاتر هەیەو پێویستی بە بەلگەی مێژووییو ئاشکرا هەیە ... لــە وەرامی پرسیارەکەی لــە بارەی شیعری پەخشانەوە کردووتانە باسی دەکەم ...

بەلێ راستە روانگە بزووتنەوەیەکی لە ناو ئەدەبی کوردیدا دروستکرد .. بەلام تێکەیشتنی هەلەو نازانستییانەشی لە ناودا بەجێهێشت ... جا من بە هیوای راستکردنەوەی ئەو تێکەیشتنە هەلەو ناراستانە لە مێشکی لاوەکاندا گەڕامەوە سەرروانگەیەك کــە چۆن کتوپڕ پەیدابوو ... هەروەهاش کتوپڕ یەکگرتنەکە هەلوەشایەوە ..

دوا قسەم لە بارەی شیعری تازەوە ئەمەیە : شیعری نوێ بە پێچەوانەی شیعری کۆن هــەتا ژیانو جیهان پێشکەوێو بیرو باوەڕو ئەقلیــەتی خەلك گەشەدارتربێ ... برەوی زیاترو لە ژیان کاریگەرتر دەبێ ... شیعری نوێ منال ... یا هەرزەکاری ئەمڕۆو لاوی دوا رۆژی نزیكو پیاوی دوا رۆژی دوورە ... !

**پ٤ : راتان چیە دەربارەی رەخنەی کوردی بە شێوەیەکی گشتی ... چ رەخنەی ســــالانی سەردەمی لاویتانو چ رەخنەی هاوچەرخ ... ؟**

و٤ : وەلام دانەوەی ئەم پرسیارە پێویستی بەوە هەیە کە شتێك لە بارەی رەخنەگرتن خۆیەوە بدوێین ... :ـ

رەخنەگرتن ... هەلسەنگاندنی کردەوەیەك ... بەرهەمێك ... باسێك ... یان مەسەلەیەکە بە هەمو لایەنەکانیەوە ... لەگەل حیسابکردندا

بۆ کاتو شــوێن ... مافی تەواودانە لــەلانی روونکردنەوەوە بــە لق‌وچلی هەریەکێك لە دوو لانەکەی ئەو رەخنــە لێ‌گیراوە ... واتــە لانی چاکی‌و خراپی ... راستی‌و ناراستی ... بــە کەلکی‌و بێ‌کەلکی وەکو خۆی کە هەیە ... بەبێ زیادو کەم نەلێی داتاشرێت‌و بڕنرێت‌و نە بخرێتە سەریشی ... رووناکی خستنە سەر ئەو لایەنانەیە تێیدا کــە خــەلکی ئاســایی بــە سانایی نابینین‌و هەستی پێ‌ناکــەن ... رێگــا خۆشکردنەوەیە لەبەردەم خۆراگرتنی لانــە باشەکەو پەرەپێدان‌و گــەشەپێ‌کردن‌و وزەوتین فرەکردن‌و پاڵپێوەنانی بەرەو پێشەوەی ... بــە مەبەستی دەســت پێوەگرتنی ... تیشك خستنە سەر لانــە لاوازو رەنج بــە فێــرۆ دەرو ناڕاســتەکانیەتی ... ڕێ‌نیشاندانە بۆ چۆنیەتی نەمانیان ... بەسەردا زاڵ‌بوونیان ... یان خــۆ دوور خستنەوەلێیان هەمو ئەم شی‌کردنەوەو روونکردنەوانە بە شێوەیەکی وەها زانستییانەو جوان‌و گونجاو کــە ئەنجامی رەخنەگرتنەکە هەر بەتەواوی‌و بە دروستی دەق‌و قەبارەو چۆنیەتی ئەو مەبەستەمان بداتە دەستەوە کە گەرەکمانەو پێویستمانە لە رەخنەگرتنەکەدا ..

دوای رەخنەلێ‌گرتن رەخنەلێ‌گیراو جا هەر شتێك بێت دەبێ هەموو لانێکی ئاشکرای ... شــاردراوەی ... پەناوپێچی ... دوور لــە رووناکێ ... چەندو چۆنیەتی دەربکەوێ‌و بــە تەواوی‌و بەرجەســتە ( مُجسَّم ) وێنەگیراوو نیشاندراوبێت ... پەنجــەی روونترکــردنەوە بخرێتە سەر ئەو جێگەو خاڵ‌و پەنایانە کە لــە شوێنەکانی تر روونکردنەوەیان زیاتر پێویستە ... جێبەجێ‌کردنی ئــەوەی ســەرەوە پێویســتی سەرشانی هەموو رەخنە گرێکە ... کــە دەبێ لانەکانی رەخنەلێگیراوەکە وەکو چۆن هــەیە بــە شــێوەو قەبارەو چەندیەتی‌و چۆنیەتی خــۆی دەربخات ... جا ئەو رەخنەگرە هەلگری هــەر چەشنە بیروباوەڕێکی ئابووری‌و کۆمەلآیەتی دەبێ بابێ ... چونکە ئەمە بەلای منەوە دەستپاکی یان دەبستپیسی بــەرزیەتی ... یا نزمی‌و ســووکی خوورەووشتی رەخنەگرەکە نیشــان دەدات ... ئەمە وەك ئەمانەت وایە چۆن دەبێ هەموو کەسێك ئەمینی بێ‌و دەستپاك بێت ... بۆ ئەم لانەش هەمان پێویستی سەرشان لە ئارادایە ... هەر کەسێك کە بزانێ رەخنەبگرێ‌و ئەم دەستپاکییەی تێدانەلێت لە دەرخستنی راستی شتەکەدا ... من بەرەخنەگری نا ژمێرم ... لــە پاش ئــەو هەنگاوەی ســەرەوە ... پاش ئــەوەی دەردو نەخۆشی‌و سەرچاوەکزی‌و لاوازی شوێنەکان ... یان بەشەکانی رەخنەلێگیراوەکە دیاردەکرێن ... نەخۆشی‌و هۆی لاوازی‌یەکــە چی‌یە ؟ کوێ‌یە ؟ چەندە ؟ چۆنە ؟ ... هتد ... ئەمجــا نۆرەی دەستنیشان‌کردنی چۆنیــەتی چارەسەرکــردنی بنــەڕەتی ... ئەگــەر نەبوو چارەسەرکردنی چارەکی ـ مۆقت ـ دێت ... هەرنەبێ بۆ ئەوەی نەخۆشی‌یەکە تەشــەنە ن[illegible] لایەنەکانی تری تەنەکەو ئەو شوێنانەش کە تووشی هاتوون لێیان پیر نەکاو قاچی قوولتر دانەگرێ .. ئەگەر ئەمەش لە توانا دا نەبوو چۆنیەتی خۆلێلادانیان‌و کــەم کردنەوەی زەرەرو زیانیان ... ئەمە نەك هەر بۆ رەخنەلێگیراوەکە پێویستەو بەس بەلکو بۆ خەلکی تریش بۆ دەرس‌و پەند لێوەرگرتن‌و لێشارەزابوون پێویستە ...

ئــەم لایەنە یان هەلسان بەو ئیشــەی لــە سەرەوە باسمان کــرد بەشێکی گرنگــە لــە رەخنەگرتندا ... بەلآم بەشی لەمەش گرنگتر رێ نیشــان‌دان‌و پاڵپێوەنانی رەخنەگرتندا بــۆ بەرەو پێشەوەچوون‌و رووەو باشتر رۆیشتن ...

ئەم چارەسەرکردنە یان کێشانی نەخشــەی چۆنیەتی خۆلێ‌لادانە ... بە پێی رەخنەگرو بیرو باوەڕەکەی دەگۆڕێ ... کە دەلێم رەخنــەگر مەبەستم ئــەو رەخنەگرەیە کــە توانیبێتی بیرو باوەڕو رێبازی خۆی لە پاش لێکدانەوەیەکی راست هەلبژێرێت ... رەخنــەگرێکی پێشکەوتنخواز جۆرە رێگایەك بۆ ئەو مەبەستە دیاری ئەکات ... کەچی رەخنەگرێکی کۆنەپەرست هەر هەمان رێگا بەرەواژ دەکاتەوە [ ئاوەژوو دەکاتەوە ] و ئەمیان بەراســـت دادەنێت ... بەلای منــەوە دەبێ رەخنەگرتن زانستیانەو مەوزووعی‌یانەو دوو لــە هەلەشەیی‌و پەلە پەل‌کردن بێ ... ئەمجا هیوای پێشــــکەوتن‌و خزمــەت‌کــردنی لێ‌دەکرێ ... دەنا ... نــا ... !

لە بارەی پێویستی بێ‌لایەنی رەخنەگرەوە لە ســــەیرکردنی ئەو شـــتەدا کە رەخنەی

لێدەگرێت ... زۆر گوتراوەو زۆریش نووسراوە ... بەڵام ئاشکرایە رەخنەگریش هەرگیز بێلایەن نابێت ... ئەمیش وەکو هەموو مرۆڤێکی تر خاوەنی بیروباوەڕی چینایەتی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە هەرشتێك ... رەخنە لێگیراوەکەشیان لە گەڵدا بێت لەبەر رۆشنایی‌و پاڵپێوەنانی هەمان بیرو باوەڕ دیاری دەکات ... ئەمە کورتەیەك بو لەبارەی رەخنەگرتنەوە بەگشتی ... کە دەبێ لە هەموو ڕەخنەگرتنێکی میللەتاندا ڕەفتاریان پێ بکرێت‌و لەبەر چاوبن ...

رەخنەگرتن لە ناو کوردیشدا وەك هەموو دیاردەیەکی تری سروشتی ئەم جیهانە بە شێوەیەکی ئاسایی‌و سروشتییانە هاتووەتە کایەوە ... لە ناو خۆماندا شەڕە شیعرو شەڕە پەندو حیکایەت گێڕانەوەو شەڕە شتی تر هەبووە ... شەوانی درێژی زستانی بەتەمەنی کوردستان خەڵك کۆبوونەتەوەو ئەو شیعرو پەندو حیکایەتانەیان هەڵسەنگاندووە بەپێی ئەو توانا سەرەتایی‌یەو بۆچوونەی ئەوسا هەیانبووە ...

لە یاری‌کردنەکاندا رەخنەگریان داناوە بڕیاری داوە کێ یاری‌کەری باشترە لە ئەوانی ترو بەو پێیە لە ناو خۆماندا جۆرە رەخنەگرتنێکی سەرەتایی هەبووە ... بە رەخنەی گەلانی تر موتوربە کراوەو گەشەی کردوە ... بەتایبەتی کاتی شەڕی دووەمی جیهانی‌و پاش کۆتایی هاتنی ... کە دەرگای رۆشنبیری سۆشیالیستی ئەورووپای بۆ گەلانی رۆژهەڵات بە کوردیشەوە کردوە ... کە بۆ ئەو قۆناغەو رادەی تێگەیشتنی ئەو سەردەمەی گەلەکەمان هەموو بەشەکانی رۆشنبیری کوردی بەم دەروازە کردنەوەیە کاری تێ‌کراو گەشەی کردو جوولانەوەو گوڕێکی تازەی تێ‌کەوت ... رەخنەی کوردیش هەروەها ...

رەخنەی کوردی بە قۆناغەکانی پێویستی هاتنە کایەوەو گەشەکردن‌و پێشکەوتنی خۆیدا تێپەڕیوەو خەریکە پێیدا دەڕوات ... ئێستا خەریکی زۆرانە لەگەڵ ژیان‌و ئەو کۆسپ‌و تەگەرانەی لە پێشیدا قوت بوونەتەوەو هەوڵدەدا تا ئەو رادەیەی بۆی دەلوێ کەڵك لە رووناکی‌و رۆشنبیری گەشەکردن وەربگرێ‌و بەرێکاوەیەو دەڕوا ...

ئەو رەخنانەی من لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری گەلاوێژو رۆژنامەی ژین‌و ئەوانی‌تردا دیومن ... رەخنەی سادەو یەك لانی‌بوون ... بۆ پێداهەڵدان بوون یان بۆ شکاندنی ... نووسەری بەرهەمەکە ئەگەر نزیکی رەخنەگرەکە بووبێت ... ئەوا زۆری بە بەرهەمەکەیدا هەڵگوتوەو ئەگەر لێیشی دوور بووبێت ... ئەوا سەرکۆنەی کردوەو سەرو گوێلاکی کوتاوەتەوە .. کەم وابوە رەخنەی زانستی‌یانەی کامڵمان بەرچاو کەوتبێ ... لەگەڵ ئەمەشدا توندو تیژی‌یەکانیان سنووری‌کیان هەبوو ... بە تایبەتی ئەو رەخنانەی کە لە گۆڤاری گەلاوێژدا بلاَوئەکرانەوە ...

گرنگترین‌و قووڵترین رەخنەی ئەو سەردەمە واتە هی چلەکان‌و پەنجاکانی ئەم سەدەیە ... ئەو رەخنانەن کە پارتە سیاسییەکانی ئەو کاتە لە هەڵوێست‌و بیروباوەڕی سیاسی یەکتریان گرتووە ... ئەمە لەوەوە هاتووە کە ئەو رەخنانە هەرچەندە زۆربەیان یەك لانەبوونەو بۆ شکاندن‌و جێ پێ‌لەق‌کردنی رەخنەلێگیراو بووە ... نووسەرەکانیان کەسانێکی خاوەن پلەی باش‌بوون لە رۆشنبیری سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەلاَیەتی‌دا.. ئەم رەخنانە کارێکی زۆریان کردۆتە سەر رەخنە وێژەیی‌یەکەشەوەو تا رادەیەکی باش پاڵیان پێوە ناوە تا لە قالبە تەسك‌و ترووسکەکەیدا دەربچێت ... هەرچەندە لە توندو تیژی‌یەکەشی زیادکردوە ... کە ئەم توندو تیژی‌یە لە ساڵەکانی ناوەڕاست‌و دوای پەنجاکاندا دیارترن ...

بەڵام بۆ رەخنەی هاوچەرخ ... ئەو ناوەی ئێوە بەکارتان هێناوە ... لە پێش ئەوەی راستەو خۆبچمە سەرباس کردنی ... بە هەڵی دەزانم کە پێشنیازێك زۆر بە کورتی روون‌بکەمەوەو بیخەمە بەر دەستی بوێژەکانمان :

وەکو لە لامان روونە ماوەی ئەو هەشت نۆ ساڵەی کە بە هۆی باری ناهێمنی تایبەتی کوردستانەوە ... لە سەرەتای شەستەکانەوە ئەدەبی کوردی بە هەموو بەشەکانیەوە تووشی خەوتن هات ... ئەم بارە درێژەی کێشا تا دوا

دوایی شەستەکان ... واتـە پێش سالی ١٩٧٠
کە لەو سالانەدا وێژەی کوردی دەستی بەجموو
جوولو بوژاندنەوە کردەوەو سەرەتای تەووژمو
گوڕێکی تازەی ئەدەبی دەرکەوت ..

چاك وایە ئێمە ماوەی ئەو هەشت نۆ سالە بە سنوور داشنێین لە نێوان وێژەی کۆنو وێژەی تازەدا بە هەموو بەشەکانیەوە ... چیرۆك ... رەخنە ... پەخشان ... شیعر ... ئەگەر تێکەلاوی یەکیش هەبێ لە نێوان ئەو دوو ماوە مێژوویی‌یەدا ئەوە هەر شتێکی زۆر سروشتی‌و ئاسایی‌یە چونکە هیچ دەرکەوتنێکی گرنگ یەکاو یەك نابێتو پێویستی بەرێگا بۆ خۆش‌کردنەوە هەیەو نیشانەکانی تاکو تەرا جاروبار دەردەکەوێ هەتا هەموو لانەکانو بەشەکانی بە تەواوی یەك دەگرنو گۆڕانێکی چۆنیەتی تێدا دروست دەبێ ..

ماوەی ئەو هەشت نۆ سالە ... بەماوەیەك دابنێین ... کە هەروەهاشە ... کە تێیدا ئەدیبانی کورد خوێندویانەتەوەو سەرنجیان داوەو زۆرانیان لە مێشكو دەروونی خۆیاندا کردوەو گەشەیان کردوەو ئەو بارە ناسروشتی‌یە بەدەیانو بەسەدان ئەشکەنجەو موعاناتی لە مێشکیاندا دروست‌کردوەو لەبەر ئەوەی ماوەی بەرهەم بلاوکردنەوە نەبووە ... پەنگیان خواردۆتەوەو کەرەستەی گۆڕانە چەندیەتیەکە تەواو بە سەریەکدا کەلەکە بووەو لەو سالانەی دوای شەستەکاندا ماوەی بلاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی دەسکەوتووەو گۆڕانە چۆنیەتیەکە دەرفەتی دەسکەوتووەو تەقینەوەکە بووە ... بەلای منەوە سەرەتای ماوەی خەوتنی ئەدەبەکەمان لە ناوەڕاست یان لە **کۆتایی سالی - ١٩٦٠ - دا دەس پێ دەکات ... بەلام سالی کۆتایی هاتنی دەکەوێتە نێوان سالەکانی ١٩٦٧ ... ١٩٦٨ یان سالی ١٩٦٩ کە ساغ‌کردنەوەی نەختێ پێویستی بە گەڕانو لێکۆلینەوە هەیە ...**

بە پێی ئەو پێشنیازەی سەرەوە ... رەخنەی ئەم سەردەمەمان لەو سالەوە یان لەو ماوەیەوە دەست پێ‌دەکات ... بێ‌گومان رەخنەی تازەمان گۆڕانێکی باشی بەسەردا هاتووە کە سەرنج راکێشە ... ئەو هەنگاوی بەرەو پێشەوە چوونەلەلانی قوولبوونەوەو ... وردبوونەوەو سەیرکردنی هەمە لانە لە رەخنەگرتندا ... بەتایبەتی رەخنەگرتن لەبەر تیشكو رووناکی تیوری زانستی‌و کۆمەلایەتی ... کە رەخنەکەمان ناویەتی‌و پلەیەی پێی گەیشتووە ... شیعری ئەم سەردەمەمان ... ئەو هەنگاوەی نەناوەو بەو پلەیە نەگەیشتووە ... لام‌وایە بەشە وێژەیی‌یەکانی تریش پێی نەگەیشتبێ ...

ئاوڕدانەوەیەك بۆ ئەدەبی پێش‌ماوەی کپبوونەوە واتە پێش سالی - ١٩٦٠ - کۆمەلێك شاعیرو چیرۆکنووسی باشمان دێتە بەرچاو ... بەلام بۆرە رەخنەگر وا[illegible] کە نیشانەی دواکەوتوویی رەخنەکەمانە لەو سەردەمەدا ... کەچی ئەمڕۆ هەر بەسەرنجدانێکی سەرپێی کۆمەلێك رەخنەگری باشمان دێتە بەرچاو ... کە زۆربەی لاونو پێشکەوتن خوازن ... ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ئەم رەخنەگرانە لە سەردەمی کپبوونەوەو خەفەبوونی ئەدەبەکەماندا خۆیان پەروەردەکردووەو پێ‌گەیشتوون ... بێ‌گومان هاتنەکایەوەی رەخنەگری باش مانای وایە کە بەرهەمی رەخنەیی باشیان لەبەر دەستی دەردەچێ ... بۆ بەبیرهێنانەوە دەلێم : رەخنەی جارانمان سادەو یەکلانەو سەرەتای‌و لە پێویست زۆر کورت‌تر بوو ... کەچی رەخنەی ئەمڕۆمان بە تایبەتی هی رەخنەگرە پێشکەوتن خوازەکانی لانی باشی‌و خراپی ئەو بەرهەمە بەبەلگەی روونو وێنە بۆ هێنانەوە شی دەکەنەوە کە رەخنەکەی لەبارەیەوە دەنووسن ... بە مەبەستی پێشخستنو بەرزکردنەوەی پلەی خاوەن بەرهەمەکەو رۆشنبیری خوێندەواران ... بەقوولی دووربینانە هەموو لانێکی بەرهەم ... پەیوەندی‌و دیالکتیکی لەگەل ژیانو تێکۆشاندا بەشێوەو زمانێکی جوانو خۆشی دەخەنە ڕوو .. ئەم هەنگاوە جوانو بەجێ‌یانەیان هەمووی هەلبەت بەپێی توانای رۆشنبیری‌و تێگەیشتنو لێکدانەوەی ئەم پلەیەی خۆیان دەهاوێن ...

بەلام ئەم بارە دلخۆشکەرەی رەخنەکەمان هەیەتی دەبێ پالمان پێوە بنێ - بە تایبەتی رەخنەگرەکان - بە قاپێلکی ئەمڕۆیان رازی نەبنو کەلك لە رەخنەگرە بەرزەکانی گەلانو کەلەپووری نەتەوایەتی خۆمان وەربگرن ... تاوەکو بتوانن

بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێن ... وەستان لەو جێگایەی کە پێی گەیشتووە بۆ نووسەر بەگشتیو بۆ ڕەخنەگر بەتایبەتی پەشمو نابەجێیەو مانای تەمەن بە فیڕۆدانو مردنیەتی... لە ڕەخنەگرتندا هەندێ کەس دڵی هەردەرەنجێ ... بەتایبەتی ئەگەر پێدا هەڵگوتن نەبووبێت بە بەرهەمەکەدا .. ڕەخنەگر شایەری جاران نیە شیعرە فۆلکلۆرییەکانیان ئامادەکرابێتو لە هەموو شاییەکدا بیلێنەوەو تەنیا ناوی خاوەن زەماوەندەکە بگۆڕن ... لەگەڵ ئەمەشدا :ـ ئەگەر گوێ نەدا بە دڵڕەنجانی خاوەن بەرهەم فرمانی سەرەکی ڕەخنەگربێت ... ئەوا پێڕەوکردنی ڕێبازێکی زانستیانەو هێنانەوەی بەڵگەی ڕاستو بەکارنەهێنانی ڕقو کینو کۆنە غەرەز لە ڕەخنەگرتندا پێویستی سەرشانی ڕەخنەگرەو زیاتریش ...

**پە : ڕاتان چیە دەربارەی تەمو مژ لە ئەدەبدا ... ؟**

و ه : بەلای منەوە تەمو مژو قسەی بە توێکڵ لە وێژەدا لە سێ حاڵەندا بەکار دەهێنرێت :

١ ـ هەندێ جار شاعیر لەبەر بارو زروفێکی تایبەتی ناچار پەنا دەباتە بەر بەکار هێنانی ئەم شێوازە یان ڕێگایە ...

٢ ـ هەندێ جار شاعیرەکانمان بەتایبەتی شاعیرانی قوتابخانەی کۆن لە ناو خۆیاندا یان لەگەڵ هی خەڵکیتردا قسەو شیعری بە توێکڵیان بەکارهێناوە ... کە ئەمەش شێوەیەکی سەرەتایی بووە لە بەکارهێنانی ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێ وێژەی تەمو مژاوی ... شێخ ڕەزای تاڵەبانی [ ١٨٣٥ ـ ١٩٠٩ ] لەم تەرزە هۆنراوەیەدا دەستێکی باڵای هەبووە ... لە دێڕە شیعرێکدا کە لە خوارەوە دەیبینین لە بەکارهێنانی ( عیبارەت )ی ( ئەوکەرە )دا مانایەکی ئاشکرای داوە بەدەستەوە کە ( گوێ درێژەکەیە )و بە شاردراوەش یان نیمچە شاردراوەش مانایەکی تر ... یان یەکێکی تری مەبەست بووە کە شێخ حەسەن خۆیەتی :

**بۆ کەرێ ئیعلانی حەربی کرد لە گەڵمان شێخ حەسەن**

**سەیری کەن یاران چ گۆیەندێکی گێڕا ئەو کەرە**

یان لە خەتە شیعرێکی تری هەمان شاعیردا کە باسی دوو ماڵ دەکا کەوتبوونە ئەمبەرو ئەوبەری شاری کەرکوکەوە ... لە دواییدا بەرواڵەت گۆیا شاعیر جێگەی خۆی نازانێتو دەڵێت ( نازانم من لەم بەرم یا لەو بەرم ) کەچی مەبەستی شاعیر هەرچەندە شاردراوەتەوە بەڵام هەر ئاشکرایە ـکە شکاندنی خاوەن ماڵەکانەو بەجۆرێکیش کە ئەوان لە بەرزەوەندییان نەبێت یان نەتوانن ئەو شکاندنە بەسەر خۆیان بێنن ...

لەوانەیە هەندێ کەس بڵێن ئەو دێڕە شیعرانەی شێخ ڕەزا بۆ جنێوپێدانەو بەس ... من ناڵێم ئەو قسەیە ڕاستی تێدا نیە ... بەڵام لە هەمان کاتیشدا شاعیر ئەو دێڕانەو ئەو تەرزە نووسینەی بە مەبەستی شاردنەوەی جنێوو مەبەستی شکاندن بەکارهێناوە ... کە شیعرو ئەدەبی تەمو مژاوی ئەمڕۆش هەر بۆ شکانو ڕیسواکردنی ئەو لانە ... یان ئەو کەسەیە کە ئەدەبەکە مەبەستیەتی ... لە وێژەی ئەمڕۆدا زۆربەی جنێوپێدانو ـ هجاء ـ لە شیعری تەمو مژاویدا خۆی دەنوێنێت ... بە تایبەتی کە خوورەوشتو دەمو دووی ئەم سەردەمە لە شاعیر یان لە ئەدیب قبووڵ ناکەن جنێوی ئاشکراو بێ پێچو پەنا بخەنە بەرهەمەکانیانەوە لە کاتێکدا ئەم هەمو جۆری دەربڕینەی ئەمڕۆ هەبێت لە ڕەخنەگرتنی ڕانستیانەو هەڵسەنگاندن ... لە وێژەوانی خاوەن پەیامی پێشکەوتن خواز قبووڵ ناکرێ جنێو بنووسێت ...

شێخ ڕەزا دەیتوانی جنێوی گەلێ پیس بەوانە بدا کە لەو دوو خەتە شیعرەدا ناوی هێناون ... بەڵام وا دیارە لەبەر ئەوەی ترس یا شەرمو شکۆیەك لە ئارادا هەبووە ... ئەم جۆرە شیعرەی بۆ نووسیون ... کە لە کاتی تۆژینەوەدا هەر لە پێشەوە ڕێگەی خۆ دەربازکردنی بۆ خۆی دیاری کردوە ... لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییە کە دەبێ بۆ وتنی ئەدەبی تەمو مژاوی دوو شتی ناکۆك هەبنو لە ناو شیعرەکەدا یەك بگرنەوە ... ئەو شتانەش :ـ

یەکەمیان : بوونی جۆشو خورۆشو بوونی

باری سەرنجو هەستکردنێکی گەورە بەپێویستی دەربڕینیان کە کپکردنەوەیانو نانە ژێر گلیان لە توانای ئەدیبەکەدا نەبێت ...

دووەمیان : بوونی ترسو زەبرو زەنگێك ... یا شەرمو شکۆیەکو شتێکی تر لەم رەنگە کــە بەرهەڵستی ئەم دەربڕینە بە ئاشکراییو بە بێچو پەنا بکات ... جا وێژەوانەکە لە هەر یەکێك لەو دوو شتە لەبەك دوورە توێکڵێك دادەتاشێتو لە یەك نزیکیان دەکاتەوەو لە دوایشدا یـەك دەگرنو بەرهەمەکە بەو چەشنە لە دایك دەبێ ...

وەکو دەبینین بەکارهێنانی تەمو مژو قسەی بـە توێکڵ لە وێژەکەماندا لە پێش نزیکی سێ چارەکە سەدە لەمەوبەر لەگەڵ هی ئەمڕۆماندا لە شێوەو ناوەڕۆکو مەبەستیشدا گۆڕانێکی زۆر فرەوانو قووڵی بەسەردا هاتووە ...

بەتایبەتی لانـەکانی بیروباوەڕو زانســـتیو وێژەو پێویستییـــەکانی ژیانو ئاڵۆزبوونی باری رامیاریو هتد ... کاریان کردۆتە سەر تــەمو مژەکەشو تەقیوەتەوەو ئەو قالبە تەسکو نیمچە ئاشکرایەی شکاندوەو قالبێکی فرەوانو شاردراوە تری لە خۆی وەرپێچاوە ...

پێویستە شتێکی تریش بخەینە بەر چــاو ئەویش ئەوەیە کە هەندێ لە لاوەکانمان لـــە ژێر پەردەی نووسینی ئەدەبی تەماویدا شتی وەهــا دەنووسن کــە لەوانەیە خۆشیان نەزانن دەڵێن چی ... یان چییان وتووە ... ئەم دیاردەیە لە ساڵی ١٩٧٠ بەم لاوە پەرەی سەندو لە شیعردا زیاتر بەدی دەکرێ ... بەرهەمی ئەو کەسانە لە بەرهەمی هەر گەلێکدا بێت بەوێژە نا ژمێردرێت ... یـەك لـە بەردی بناغەی وێژە نا ژمێردرێت دەبێ‌روونو ئاشـــکرا ـ بەتایبـــەتی ئـــەدەبی شۆڕشگێڕ ـ مەبەســت بدا بـــە دەستەوە ... ئەگەر بەپێچو پەنا لـە ژێر چینێ تەمو مژدا مانا دەربڕێت ... با ماناکەش هەموو کەس تێ‌ی نەگات ... هەندێ کەس تێ‌ی بکات لەوە باشترە هەر کەس نەی‌بینێتو لە ناو مێشکی وێژەوانەکەدا گۆڕبکرێت ... دەردی مەســـەلەکەی مـــەلای مەشوور وتەنی : ئەوانەی تێ‌دەگەن بۆ ئەوانەی روونکەنەوە کە تێ‌ی نەگەیشتوون ... بەڵام ئەگەر هەر هیچ مانایەك دەرنەخات ... ئەوە نە ئەدەبەو نـــەهیچ ... بەتایبەتی ئەگەر ماوەی دەربڕینی ئاشکرا هەبێت ...

بۆ نموونە دەڵێم جار بوە لە توانادا هەبووە دوور لە تەمو مژێك هەمو شت یان زۆر شت بڵێت .. کەچی ئەو کەسانەی من لێرەدا باسیان دەکـەم لە ژێر ناوی ئەدەبی شۆڕشگێڕدا هەر لەســـەر ریزکردنی وشـــەو رستەی کەس تێ‌نەگەیوەکانی خۆیان رۆشتوون ... ئەوە مانای چی ؟ لەوە بەدەر کە ئەمانە هەر لە بناغەدا هیچیان پێ نەبووە بیڵێن ... ؟ وا دەر دەکەوێ کە تەمو مژ هـــەر خۆی لە لای ئـــەم ئەدیبانە ئامانجەو مەبەستەو هیچی تر ... بەردو [illegible] شیعرو ئەدەبیان بەرادەیەك گۆڕی بو کە دەیان گوت : شیعر هەتا مـــەبەست شاردراوەترو نادیارترو تەمـــاوی تر بێت ... ئەوا باشترو بە کەڵكترو ( رەسەن !! ) ترە ... !!

٣ ـ لە بارێکی تریشدا بەکارهێنانی تەمو مژ لە ئەدەبدا راستو بەکەڵکە ئەویش ئەمەیە کە لە بارێکی زۆر تایبەتی‌دا ئەگەر تابلۆیەکی شیعر دروستکرابێتو مانای مەبەست بدا بەدەستەوە بەڵام بۆ جوانترکردنو قووڵترکـردنەوەی مانای تابلۆ شیعرییەکە ئەگەر لـــە هـەندێ شوێنیدا تەنکە سێبەرێکی بخرێتە ســـەر وەك تابلۆیەکی هونەری وێنەکێشان ئەوا بەکارهێنانی ئەو تەمو مژە لـــەو شوێنەدا بەجێیـــەو وەستاکارییەك دەنوێنێت ... !

**پ٦ : چەند بەرهەمتان لە چاپ داوەو بەلای خۆتانەوە جوانترین بەرهەمتان کامەیە ؟**

و٦ : هەتا ئێستا سێ نامیلکەو دوو کتێبی شیعرم لە چاپداوە کە بەم جۆرەی خوارەوەن :

**١ ـ لە ساڵی ١٩٥٧ لە کەرکووك کە ئـــەو کاتـــە لـــە کۆمپانیای نەوت ئیشم ئەکـــرد .. نامیلکەیەکی هەمە جۆرم لە چاپخانەی ـ ترقی ـ لە چاپدا بە ناوی ـ گزنگی هەتاو ـەوە ... ناو ئاخنەکەی بریتیبوو لە هەندێ وتارو پـەخشانو یەك دوو پارچە هۆنراوە چیرۆکی کورت ...**

**٢ ـ لـــە ساڵی ١٩٥٨ لـــە پێش شۆڕشی چواردەی تەمووز دوو نامیلکەی بچووکم لە بەغدا [ خولەو بلە ] لە چاپخانەی ( الوفاء )و ( کەوای**

نەگرای ) لە چاپخانەی ( معاریف ) لە چاپدا ... ناوەڕۆکی نامیلکەی یەکەم چیرۆکێکی کۆمەڵایەتی بوو کە هەندێ کەمو کوڕی کۆمەڵایەتی لە قالبێکی پێکەنینو گاڵتەجاڕیدا دەردەخست ...

نامیلکەی ( کەوای نەگرای ) واتــە کەوای نەگراو بە شێوە زمــانی کۆیـە نووسرابو ... چیرۆکێکی کورتە ژیانی خێزانێکی رەنجبەری ئاغا دەردەبڕێ ... کوڕو دایکێك بوون کوڕەکە ساڵی تەنیا بە سێ دینار ـ ـر٣ ـ دینار رەنجبـــەری دەکرد ... چەند ساڵ دایکەکە چاوەڕوانی هەلێکی کردوە کە شتێك [illegible] دینارە لە قەرزو قۆڵەی ساڵانەیان بمێنێتەوە [illegible] کەوایەکی پێ دروست بکات ... کەچی ( پلکە پیرۆز ) ئــەو هیوایەی لەگەڵ خۆیدا بردە ژێر گڵەوەو کەواکە هــەر نەکرا ... !

ئەم چیرۆکەم بە چاوی خۆم دیوە ... وا دەزانم ئەمڕۆیە کوڕو دایکەکە دوا جار لە ماڵی ئێمە لە کۆیە دانیشتبوون ... باسی دابەش کردنو خەرج کردنی سێ دینارەکـەیان دەکـــردو پارەی کەواکە نەمایەوەو بڕیاریاندا ـ ئینشاللا ـ ساڵێکی تر کەواکە دروست بکەن ... !!

٣ ـ لــە ساڵی ١٩٦٩ لە چاپخانەی ( دار السلام ) لە بەغدا دەستم کـرد بـــە چاپ کردنی یەکەمین کۆمەڵە شیعرم ... بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبێل لەیەك داندا قاچم شکاو لەبەر بێکەسیش ( ئاگرو گوڵ ) لە سەرەتای ١٩٧١ کەوتە بازاڕەوە ...

٤ ـ لە ساڵی ١٩٧٩شدا دووەم کۆمـــەڵە شیعرم لە چاپداو بڵاوکردەوە بە ناوی « بەرەو لووتکەی ئاوات »ەوە ... لە چاپخانەی زانکۆی ســـلێمانی چاپ کـــراوەو ـ ١١٢ ـ لاپـــەڕەیەو پێشەکییەکەشی هەر خۆم نووسیومە ... ئــەم بەرهەمەیانم ... بە تێکڕایی لە هەموو ئەوانی تر خۆشتر گەرەکە ...

**پ٧ ؛ پرۆژەی ئەدەبیی داهاتووتان چییە ؟**

و٧ : پرۆژەی ئەدەبیی داهاتووم کۆکردنەوەو چاپ کردنی هەندێ وتارە کە لەماوەی جیا جیای ژیانمدا نووسیومنو هەندێکیان لە ڕۆژنامەکاندا بە کوردیێ یان بە عەرەبی بڵاوکراونەتەوە ...

پرۆژەیەکی تریشم بەدەستەوەیە ئەگەر بـە پیرۆزەی ئەدەبی بژمێردرێت نووسـینی کتێبێکە دەســــتم داوەتێ لــە بـارەی ئافرەتی کوردەوە دەدوێت ... بە جۆرێك کـــە هەموو لایەنێکی ژیانیـان بگرێتەوە وەك بەشـێك لــە ئافرەتانی هەموو جیهان ... ئافرەتی کورد وەك مرۆڤ وەك دایك وەك ئیشکەر ... وەك ( رەگەز = Sex ).. ئەم لانانە بە بەڵگەی ڕاستو ســـەر ئەژماری ( احصاء )ی باوەڕ پێکراو دەســـت نیشـــان بکات ...

خێزان ... ژن هێنانو شـووکردن ... لــە نـاو مرۆڤدا چۆن پێك هاتووەو بە چ قۆناغێکدا تێپەڕیون لە ناو گەلانی ئەم جیهانە فرەوانەدا ئایا لە ناو کوردستانیشدا هــەر وابووەو بــە هــەمان قۆناغو گۆڕاندا تێپەڕیون ... ئەم مەبەســـتو پرسیارانە بە بەڵگەی ڕوونو ئاشکرای کوردەواری خۆمانو رەسەن ساغ بکرێتەوە ...

**پ٨ : لەم سەردەمەدا گەلێ ڕێبازی ئەدەبی پـەیـدابووەو لـە ئـەوروپـاوە بـە وڵاتی ئێمـە گەیشـتووە ... ڕاتان چییـە دەربارەی لاسـایی کردنەوەی کوێرانەی ئەو جۆرە ڕێبازانە ... ؟**

و ٨ : هەر وەك لـە پرسیارەکەی خۆتاندا دەردەکـەوێو هــەر ئەوەش راســـتە ... لەم سەردەمەدا ئەو ڕێبازە ئەدەبییانەی پەیدابوون .. ســــەردەمێکی برجـوازیو ئەوانەش ڕێبازی برجوازین ... بـە تایبەتی کـــە لـە ئەوروپـای برجـــوازیو ســـەرمایەدارەوە بـــە وڵاتی ئێمە گەیشتوون ...

بێ گومان رای من لەگـەڵ ئەوەدا نیـە کـــە وێژەوانەکانمان کوێرانـە لاسـایی ئـەو ڕێبـازە وێژەیی یانە بکەنەوە ...

ئەوەی لەبەرهەمەکـانی من وردبێتەوە بۆی روون دەبێتەوە کە من لەسەر رای پێش خستنو قووڵترکردنەوەی ئەدەبەکەی خۆمانم ... ئەمجا موتوربەکردنی بـە ئەدەبی گـەلانی ئازادیخـوازو پێشـــکەوتوو ئەو ئەدەبانەی دانوویان لەگـــەڵ ئەدەبەکەی ئێمەدا دەکوڵێ لەسەر رای ئەوەم کـە هەموو شتێکمان ... هەموو جموجووڵێکمان .. بیرکردنەوە بێت ... نووسـین بێت ... یان کردەوەی تر دەبێ لە خۆمانەوە دەست پێبکات ..

هیممەتێك ... تۆوێك ... گەرایەك ... یان پاڵپێوەنانێکی خۆمانی لـە گەڵدابێت ... ئەمـە ئەگەر بەراسـتی مەبەستمان بێت ئـەو کارە بـە خۆمان ئەنجام بدەین‌و بەرهەمەکەش بۆ خۆمـان بێت ... ئەگـەر هیچی خۆمانی لەگەڵـدا نەبێت بەچی رووبەك بەهی خۆمانی لە قەڵەم بدەین .. ؟

تاقیکردنەوەی خەڵکی تر کـە بـە هـەوڵ‌و تەمەن لە پێناو دانان‌و ئارەقەی ناوچەوانی خەڵکی تر هاتبێتە کایەوە ... ئێمە راستەو خۆ بیهێنینە ناو ماڵەکەی خۆمان‌و بڵێین هی خۆمـانە ؟ من هـەرگیز لەگـەڵ ئـەم رایـەدا نیم ... هـەر بەسەرنجدانێکی سـەر پێی لە باری وێژەی کوردستانەوە ... لە سەرەتای بیستەکانی ئـەم سەدەیەوە تا ئەمڕۆ ئەم راستی‌یانەی خوارەوەمان بـۆ دەردەکەوێ : کـە ئەگەر بـە قووڵی تێیـان رابمێنین دەردو نەخۆشی‌و نووچدان‌و کۆسـپە ئەدەبیەکان‌و جۆرو چۆنیەتی چارەسـەرکردنیانمان بۆ دەردەکەوێ ... و بۆمان روون دەبێتەوە بارە وێژەیی‌یەکەی کوردسـتان دروسـتبوونی یـەکگرتنی بنچینەی وەك روانـگە بۆچی قبـووڵ دەکات‌و کەم تا زۆر پشتیوانی لێ دەکات ؟ ئاشکرا دەبێ بۆچی چەپڵە بۆ لاسایی‌کردنەوەی کوێرانەی رێبازو هەنگاوی ئەدەبی وڵاتانی تر لێ‌دەداو ئـەو جۆرە جموجووڵەو هی تـریش بـەبێ لێکدانـەوە دەگرێتە باوەشـەوە ؟

سـەربەسـتی نووسـینی ئەدەبی‌و بڵاوکردنەوەی ماوەو مـەودای ئەدیبان بۆ گورج‌و گۆڵی نواندن ... بە زۆر بارو کاتی جیـاجیـادا رەت‌بووە ... ئەو سەربەستی‌و ماوەو مەودایـە تەسـك بۆتەوەو فرەوان بۆتەوە بەپێی ئەو بارو کاتانە ... جاری وەها هەبووە دوو سێ گۆڤارو رۆژنامەی کوردی یان زیاتریش هەبوە ... مـاوە بووە هـەمـوو جـۆرە کتێبێـك چـاپ بکـرێت‌و بڵاوبکرێتەوە ... بەم جۆرە ئەدیب‌و نووسـەران تا رادەیەکی باش لە پەنگ خواردنەوەو کپ‌بوونەوە دوور بوونـەو جەماوەریش لـە بـارێـکی پڕ لـە تامەزرۆیی‌و برسـێتی‌و تینوویـەتی بۆ ئەدەبی راستەقینەدا نە ژیاون ... جاری وەهاش هەبووە هـەر بەجـارێ چۆڕ بڕکراوەو ئەوەی هەر پێی وترابێ بـەرهـەمی ئـەدەبی کـوردی مـاوەی بڵاوکردنەوەی نەبووە ... وەك ئەوبارەی کە لـە ساڵی ( ۱۹٦٠ )ەوە دەستی‌پێ‌کردو حەوت هەشت سـاڵێك درێژەی کێشـا ... کە لە وەرامی چوارەم‌و پێنجەمدا باسم‌کرد ... ئەمـەوە کـار - فعل - ێك بژمێرین کـە کاردانەوەی هەبووە - رد الفعل - بەم شێوەیەی خوارەوە : ئەدیبـان لەو کاتانەدا مێشـکیان ئاوسـاوەو پەنگی خواردۆتـەوە ... ئـەو بـارە ئامادەیی لـە نـاو زۆربەیاندا خوڵقاندوە کە هـەر لەگەڵ لاچوون‌و لادانی ئەو بارەدا بەرەو هەر بیروباوەڕو رێبازێکی ئەدەبی‌دا دەست درێژبکەن ... جەماوەریش لـە پاش ئەو هەموو برسێتی‌و تینوویتی‌یەی شاڵاوی بۆ هەموو بەرهەمێکی ئ[illegible]ووە ... هـەر کوردی بێ‌و بخوێنرێتەوە جا خوا بکەم چی دەبێ بـا ببێ ... خـۆ ئەگەر ئەو بەرهەمە لـە ژێـر پەردەی پێشکەوتن‌خوازی‌و نوێ‌کردنەوەی ئەدەب‌و تازە پەرستی‌دا بێت ئەوە هەر لێ‌ی‌گەڕێ !! کێ رایەکی دەکـەوێ گلەیی‌یەکی لـە بـارەیـەوە دەربڕێت ... ؟! ئـەمـەش وەك کـاردانـەوەی کارەکە ...

**پ۹ : چۆن تەماشای شیعری پەخشـان دەکەن‌و راتان دەربارەی چیە ؟!**

و ۹ : ئەگەر بمەوێ وەرامی پرسیارەکەتان بە روونی‌و بەشێوەیەکی دەست‌گیرو ئاسـان‌و دوور لە تێکەڵ‌و پێکەڵی بدەمەوەو وەکـو کـە گەرەکمە بیخەمە بەردەستی خوێندەوارانەوە ... پێویستە سنوورێکی دیاری‌کراو هەبێت لە نێوان سێ خوشکی لەیەك‌چوودا ... کـە مەبەستم : پەخشان‌و شیعری پەخشان یا پەخشانە شیعرو لە نێوان شیعری تازەدا .. چونکە وەك ئاشکرایە جیاوازی کردن لە نێوان یان راو ناسینەوەیان بۆ زۆربەی خەڵك بەشێکی زۆر لە خوێندەوارانیشیان لەگەڵدا بێت ئیشێکی گرانە چ جای خەڵکی لـە نەخوێندەواری‌دا کلۆڵ ... بەتایبـەتی هـەر چەشنەیـان بـە پێی چۆنیەتی خـودی خـۆی هەڵدەکشێ‌و رادەکشێ بۆ ریزی ئەو چەشـنەی سەرەوەی یان خوارەوەی خۆی ...

ئەوەی من ئاگاداربم ئەم‌دیوەو نەشـم بیسـتووە کـە هەتا نووسـینی ئەم دێڕانە لێکۆڵەرەوەیەکی وێژەیی ( باحث ادبي ) کـورد خۆی لەو هەورازە دابێت‌و هەندێکیان لە بارەوە

دوابێتو دیاری کردبێت کە سنووری هەریەکەیان لە کوێی ئەوی تر دەگەڕێتەوە ... جاریَ باوەك پرسیارە دێرینەکەی [ ئایا هێلکە لە مریشکە یان بە پێچەوانەوە ... مریشك لە هێلکەیە ؟ ] منیش بپرسم : [ ئایا شیعر زادەی پەخشانە یا بەرەواژەکەی راستە ... پەخشان کوڕی شیعرە ؟ ] لەو ڕایانەی دەری دەبڕم خۆم بە دوور لە هەڵە نازانم ...

وردبوونەوەیەکی ئاسایی‌و سەرنجدانێکی سادە بۆ هێنانە بەرچاوی ئەو قۆناغە سەرەتایی‌یەی ژیانی مرۆڤ بەخۆیەوە دیوەو زۆر لە زاناکانیش هەر کەسە لەلای [illegible] بە لێکۆڵینەوەی خۆی هەڵساوەو بە بەڵگەی گومان لێ‌نەکراو ساغیان کردۆتەوە کە مرۆڤ لە سەرەتای ژیانی‌دا ژیانێکی زۆر سادەو سەرەتایی ژیاوەو زمانێکی نەبوە کە لەو شەو زاراوەو رستەو هتد ... پێك‌هاتبیَ‌و قسەی پێ‌بکات ... لە پاش تێپەڕینی زۆر گۆڕان‌و پێشکەوتن بەسەری‌دا گەیشتوونەتە ئەوەی زمان لەناویاندا بێتەکایەوەو پاش ئەوە ئەوجا خەت‌و نووسینی بە وێنەو بەجۆرە نووسینی زۆر سەرەتایی ئەو سەردەمە چاوی لە جیهانی بووندا هەڵهێناوە ... لە پاش پاراوبوونی زمان‌و ڕوونبوونەوەی وشەو زاراوەو رستەکانی‌و ڕوودانی گەلێ پێشکەوتنی تر لە هەموولایێکی ژیانی‌دا ... وێژەش دەستی کردووە بەرەگ دروستکردن‌و پەل‌وپۆ هاویشتن‌و بەژن‌و باڵا دەرخستن‌و خۆنواندن ...

بەزانینی ئەو راستی‌یەی سەرەوە پرسیارە سەرەکییەکە بە جۆرێکی تر دەکەمەوەو دەڵێم :

ئایا لە تواناندا هەبووە هەر لەو هیچەی هێنامانە بەرچاو شیعر هاتبێتە کایەوە ... ؟! یەکسەرو راستەو خۆ : لە نەبوونی هیچ جۆرە داڕشتن‌و پەخشان‌و پێرەوکەبوون‌و بە هێزبوونیان یەکسەر شیعر زۆر لە هیچەوە زۆر لەوەش سەیر تر کە لە چیرۆکە ئەفسانەیی‌یەکاندا هاتووە تاڵەمووی بۆ هەڵکوڕوزێنرابێت ... بە جۆرەکیش‌و سەرواو مۆسیقای شیعری‌یەوە با ئەو مەرجانە زۆر سادەو سەرەتاییش بووبن هەر لە پڕێ بووبێ بە کوڕێ‌و هاتبێتە کایەوە ... ؟! بێ‌گومان نەخێر ...

کەوابێ ئەو باڵاخانەیە دەبێ بناغەو دیوارەکانی ژێرەوەی هەبووبێت‌و لە کەرەستەی زمان‌و ئەدەب پێك‌هاتبن ... هەروەها دەبێ ئەو کەرەستەیەش لە شیعری ساوای ئەو سەردەمە ساواترو سادەتر بوبێت ... واتە دەبێ بەپێی هەست‌و زەوق‌و تێگەیشتن‌و بۆچوونی خەڵکی ئەو سەردەمە لە سەرەتادا لە وشەی جوانەوە دەستی پێ‌کردبێت کە جۆرە سۆزو هەستێکی دەربڕیبێ ... لەمەوە لەگەڵ گۆڕانی لانەکانی ژیانی ئابووری‌و بەرهەمهێنان‌و ئاژەڵداری‌و کشت‌وکاڵ‌کردن‌و نیشتەجێ‌بوون‌و هتد ... و لە پاش ئەمانەشدا خۆشتر بوونی جۆری ژیانی مرۆڤ ... ئەو وشانە بەرە بەرە بووبن بە دوان‌و سێ‌یان بووبن بە رستەو پتەو ترو چڕترو داڕژاو تر بووبن‌و ئەمجا سەرواو کێشیان تێ‌کەوتبێ‌و لە پاش کرانەوەی سەرو دڵ‌و سەلیقەیان مۆسیقاو ( نەزم‌و راگر = ایقاع ) خۆی خزاندبێتە ناویەوەو بووبێ بە پەخشان ... ئەمجا دەستێکی تری بەو پەخشانەدا هێنابێت‌و هەندێ گۆڕانی تێداکردبێت‌و لە چڕیەکەی خەستی‌و لە سەرواکەی جوانی‌و لە کێش‌و مۆسیقاکەی ڕێك‌و پێکی‌و خۆشی لێ‌زیاد کردبێت‌و بە شێوەی شیعر بە بوونێکی تازەوە دەرکەوتبێت کە لەگەڵ پەخشان‌دا جیاوازی بووبێت ...

لێرەدا بەپێی ئەو ڕوونکردنەوەیەی سەرەوە لانەکانی ئەو پرۆژەیەی ئێمە لێ‌ی دەدوێین وەك کێوێك بهێنینە بەرچاومان ... دەتوانم بڵێم کە : شیعر لووتکەی جوانی‌و پوختی‌ی کاریگەری‌ی

هەموو جۆرە داڕشتنەکانی هەست‌و نەست‌و بیروباوەڕو هەڵوێست‌و مەبەست‌و رازو نیازو دەربڕینیانە لەناو وتەی مانا لێك‌دراوەو خاوەن کێش‌و نەزم‌و راگرو مۆسیقاو سەروادا .. واتە شیعر لووتکەی ئەو کێوەیە ... !

شیعرمان ناساند بە لووتکەی هەرە بەرزی کێوی ئەم بەشەی وێژە ... جا بۆ ئەوەی وێنەکە بە جوانی نیشانی خوێندەوار بدەین‌و وابکەین بە ئاسانی تێ‌ی بگات ... چاك وایە ئەمجا دامێنی کێوەکە باس بکەین کە پەخشانە ...

لە نووسینی پەخشاندا پێویستە حیسابێکی باش بۆ شێوەو فۆرم بکرێ ... بە پلەی یەکەم

ئەم لانە پەخشان لە نووسینی ئاسایی جیادەکاتەوە ... هەتا رێك و پێكترو جوانترو بەکەلکتر بێت لە پەخشانە شیعر نزیك دەبێتەوەو ئەگەر پووچ و بێ فەرو رەزاگرانیش بێت ئەوا دەبێتە نووسینێکی ئاساییو لەویش کەمتر با هەر ناویشی پەخشان بێت !! کەمان خەلك نەدیوە ناوە جوانو خۆشەکانیان خەسار کردوە ... !! نووسینی پەخشان ئاسانترە لە نووسینی پەخشانە شیعر ... بۆیە ئەو باس و باری سەرنج و مەسەلانەی قووڵ و وردو فراوانو ماوەی پەل هاویشتنیان بۆ ئەم لاو ئەولاو کەم تێدایە ئەگەر بە پەخشانی بنووسیت باشترو خێراتر دەگاتە مەبەستی خۆی ...

بۆ نموونە وا پارچەیەك پەخشانی فۆلکلۆری دەخەمە بەرچاو کە دانانەکەی بەلانیکەمی لە پەنجا ساڵ لەمەوبەر کەمتر نیەو لە یەکێك لە ـ حەیران ـەکان وەرمگرتووە .. دانەری پارچە پەخشانەکە وەك دەردەکەوێ لە چوارچێوەو لە ناو کەرەستەی دروستکردنی کەپرێکدا بۆ خۆشەویستەکەی خولاوەتەوەو بەپێی توانای ئەو سەردەمە نەیتوانیوە زۆر ئەم لاو ئەولا بکاتو دوو باڵ و چوار باڵ بەخەیاڵەکەیەوە بنووسێنێت و مەودا بۆ خۆی فرەوانو بەرین بکات و پەخشانەکە بکا بە شیعر ... بۆیە بەم پەخشانە جوانە کە لەپلەی پەخشانە شیعردایە کە پرەکەی بۆ نازدارەکەی دروستکردوە ..

### دەقی پەخشانەکە

**سێبەری سەفینی بەسەر ماڵەدیاناندا دەڕۆیی**
**دەمگۆتەوە بەژنی باریك**
**دەوەرە ئەوسارەکە هاوینە گەلەك گەرمە**
**ئەمن کەپرەکی لە بۆ تۆ دەکەم لەسەری سەفینیی**
**بناغەی ئەوی کەپرێ دادەنێم لە سۆتکەی**
**دیواری دەکەم بەقەنەفلێ**
**کاریتەی داوێمێ لە داری سۆر گوڵێ**
**هەڵاشی دەکەم بەرەشە ریحانیێ**
**خۆرەبانی دەکەم بە گلێ**
**سواغی دەکەم بە خەنەی**
**ماڵنجی دەکەم بەخاسە رەنگێ**
**دەیڕشێنم بە گوڵاوێ**
**شەوێ لە سێباری نیوە شەوێ**
**دەستێ بەژنێ نەرمۆکە دەگرم ...**
**دەینمە ناو ئەوێ شانە شینێ**
**شەوبای شەوی لێبدا**
**بۆنی بڕوا بەسەر ماڵە جیرانان ...**

پەخشانە شیعر جگە لەوەی کە دەبێ هەموو مەرج و کەرەستەو رەنگ و بۆنەکانی پەخشانی تێدابێت کە لە سەرەوە باسمان کرد ... دەبێ نەزم و راگرو جارو بار سەرواشی تێدا هەبێت .. هەتا رێك و پێکتر بێ لە شیعرو هەتا پێچەوانەبێ لە پەخشان نزیك دەبێتەوە ...

هەموو شتێك لە پلەی ژێرەوە بەرەو بەرزی ئەچێ ... بۆیە بەکارهێ[illegible]اوەی پەخشانە شیعر بە جوانتر دەزانم لە شیعری پەخشان ...

شیعری تازەش کە لەسەر پەخشانو پەخشانە شیعر رادەوەستێ ... بوونی سەروا .. بوونی کێش ... بوونی مۆسیقایەکی خۆشی زرینگەدار تێیدا لە ئەوانیشی بەرزتر دەکاتەوە .. بۆیە شیعری تازە ئەگەر هەر یەکێك لە : کێش و مۆسیقاو سەروا لە دانانیدا رەچاو نەکرابێت لە لووتکەکەی دەهێنێتە خوارەوەو دەیخاتە سەر یالەکانی پەخشانو لە بارانو بەفر بارینو هەرەسی رماندا دەکەوێتە ژێر پامالی شیعرەوە ...

ئەو دارشتنە وێژەییە پلە بەرزەی گەیشتۆتە لووتکەکەو تا ئێستا پێمان وتووە : شیعری تازە ... شیعری سەربەست ... یان شیعری شێوە نوێ زۆر لە دەمێکەوە هەیەو هەموو گۆرانییە رەسەنەکانو حەیرانو لاوك و زۆربەی ئەو بەندو داستانو ئەفسانەی دێرینانەی بۆمان ماونەتەوە بەم جۆرە دارشتنە لووتکەیە نووسراون کە سەرجەمی مەرجەکانی ئەو شیعرانەیان تێدایە کە ئەمڕۆ دەنووسرێن ... وەك ساغیبیان لەلانی زمانەوانیو جوانیو خۆشیو رەسەنی دارشتنەکانیانو بوونیکێش و مۆسیقاو سەرواو ... هتد ... !

بۆ نموونە چەند پارچەیەکیان لێ دەخەمەوە بەرچاو کە تەمەنی هیچ کامێکیان لە شەست حەفتا ساڵ کەمتر نیە ... بە مەزەندەی من زۆر زیاترە بە تایبەتی ئەو یەك دوو کۆپلەیەی لە گۆرانیەکانی سێوەی هونەرمەند وەرم گرتوون کە بەلانی کەمی دوو سێ پشت لە پێش سێوەوە هەبوەو تەمەنیان لە سەدەیەکی تەواو کەمتر نیە

ئەگەر زیاتر نەبێ ... لە یەکێك لـە گۆرانیەکانی سێوەدا کە ساڵی ١٩٥٢ لە ئیستگەی بەغدا تۆماری کردوون ئـەم دوو کۆپلەیـە دەخەمـە بەرچاو :

— ١ —

**ئەرێ گوڵێ ... گوڵە جوانێ**
**سنگ سپیێ ... مەمك فنجانێ**
**داك حدودێ باب شا سەیوانێ**
**ئەرێ خواکەی گوڵێ ئەگەر جەللادان**
**لەمن دەگرن چوار گۆشەی مەیدانێ**
**چەرخەچی شا م[illegible]ن دەردێنن لە کالانێ**
**تو عەشقی خودای بەوی رۆژی جومعەیە**
**شەمووی بەسەردا دێ**
**ئەوان گرتیان بەردەوە لەبەندی خانێ ...**

— ٢ —

**ئەرێ گوڵێ ... ئامان گوڵە سەرێ**
**کەزی زەرد ... چاو سەفەرێ**
**خواکەی سەرت پێنەدەرێ**
**لە تاقان لە پەنجەران**
**لە چوار کناران**
**ئەی برادەرینە**
**وەمن چەندی حەکیمو لوقمانم هاتینە سەرێ**
**ئەگەر حەکیمو لوقمان دەرێن :**
**برینداری گورێیەو پێی نابەین زەفەرێ ...**

★

لەبەیتی شێخ فەرخیدا ... خـاتو ئەستێ ئەم چەند بەندەی داوێتێ :

**ئەرێ هۆ کەوڵ سووری لە سەربانیی**
**بە تۆ دەڵێن ووسووی موغانیی**
**ئەتۆ خۆشەویستی لە ماڵی میرانیی**
**توخوا بە دەستەکی دەستوبرد**
**هەر بە پێیەکی رەوانیی**
**خەبەرەکێم لەبۆ بدەوە ماڵی میرانیی**
**رەبی خاتوون کوێر بێ لە چاوان**
**لاڵ بێ لە زوبانی**
**ئەوە فەرخی ئامۆزام**
**لێرەکەوتووە ... بەبێ زوبانی ...**

★

پەخشانە شیعریش ... وەك بەشێك لـە ئـەدەبەکـەمـانو وەك یەکێك لـە خێزانی ئەدەب جێگەی دیاری خۆی هەیە ... هەرچەندە ئێستا دەورێکی ئەوەندە کاریگەری نیە لە ئاستی شیعرو چیرۆك رەخنەو هتد ... بەڵام پاشـــە رۆژی روونەو لە دوا رۆژدا چاوەڕوانی دەوری گرنگتری لێدەکرێت ... کە بیگێڕێت ...

**پ١٠ : جگە لە شیعر هیچ بەرهەمێکی کەی ئەدەبی یا هونەریتان هـەیـە ... و ... ئـایـا دەکـرێ لـەو لایـەنـەوە چەکێکمان بـۆ روونکەنەوە ... ؟**

و ١٠ :

١ - شیعرو ئاوازی - ٢٥ - بیستو پێنج سروودو گۆرانیم دانـاوە ... لەگەڵ ئـاواز بـۆ هۆنراوەیەکی گۆران بە ناوی (بۆ جوانی سەرەڕێ) لە ناوەڕاستی مانگی مارتی ١٩٥٧ بۆ یەکەم جـار سروودو گۆرانیم لە ئیستگەی بێتەلی بەغدا بەشی کوردی تۆمارکرد ... هەتا سـاڵی ١٩٥٩ جاروبار بە تایبەتی لە ناوەڕاستی مانگی مارتی ئەو ساڵانەدا بۆ تۆمـارکردنی ســـروودو گۆرانی دەچـوونـە ئیستگەی ناوبراو ... ئێستا هەندێ لەو سروودو گۆرانیانە بەدەنگی خۆم لەو ئێســـتگەیە هەیەو بڕێکیان لە ئاهەنگە گشـــتیە نیشـــتمانیو نەتەوەییەکاندا خۆم پێشـــکەشـــم کردوونەو تۆمارکراونو هەندێکیشـــیان بـــە دەنگی هونەرمەندەکانی تر تۆمارکراونو بڵاون ... دوو گۆرانیشیان نزیکەی دوو ساڵ دەبێ لە لایەن تیپی مۆسیقای مەولەویو تیپی منـاڵانی بیخود لـــە ســـلێمانی تۆمارکراونو تا ئێســـتا بڵاو نەکراونەتەوە ...

بەشێکیش لەو سروودو گۆرانیانە چۆن لـە کـاتی خۆیاندا ئامادەکـراون هەروا ماونەتـەوەو تۆمارنەکراونو تەنانەت لە هیچ ئاهەنگێکیشـــدا پێشکەش نەکراون ...

لە کۆتایی هاتنی وەرامی ئەم پرسیارانـەدا ســـوپاسی زۆری دەزگای رۆشـــنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردیو نووسینگەی دەزگاکە لـە سلێمانی دەکەم کە هەلی دەربڕینی ئەو راســـتیو راوبـاری ســـــەرنجە تایبـەتی یانەیـان بۆ رەخساندم ...

# کۆڕی کورتە چیرۆکی کوردی

● **لە پێشەوە کاك صلاح شوان گوتی :**

کاك احمد محمد اسماعیل دەڵێ کورتە چیرۆکمان لە ئاستی بارو دۆخمان‌دا نیە . ئەم وتەیە دەشێ ڕاستبێ ، بەڵام لەکاتێکدا کە زۆر شت دەگرێتەوەو هیچیش ناگرێتەوە . بارودۆخمان ئێستا پێویستی بەلێکدانەوەی زۆر هەیە .

● **کاك حەسەن جافیش :**

لەسەرنجەکانیا باسی ئەوەی کرد کە گوایە دەبێ ئەدیب بەپێی قۆناغە مێژوویەکان پێش‌بکەوێ ، بۆ نموونە ئاساییەکە چیرۆکی سالآنی سی وەکو هی ئێستا نەبێ . یان دەبێ ساڵ بە ساڵ پێش‌بکەوێ . ئەمە هیچ مەرج نیە .

کورتە چیرۆك هونەرەو هونەریش پەیوەندی بە بەهرەوە هەیە . **کە چیخۆف سەری هەلداو لە دوای ئەو لەگەل ئەو هەموو پێشکەوتنەی ولآتەکەی بەخۆیەوە دی ، چیخۆفێکی دی چیخۆفێکی دی لەبواری کورتە چیرۆکدا پەیدا نەبوو ، هەروەها سەبارەت بە شەکسپیری ئینگلستانیشەوە هەر بەم جۆرە .** پێشکەوتنی ئەدەب وەك پێشکەوتنی زانستی کۆمەلآیەتیو تەکنۆلۆژیا نیە . نابێ وەکو پێشکەوتنی ئەوان بپێورێ .

● **کاك حەسەن** وای دەرخست کە باس کردنی سێکس بە ئاشکرایی لە کەموکوورییەکانی کورتە چیرۆکی ئەمرۆمانە . من بەپێچەوانەوە دەیبینم . بۆ نموونە ئەدیبە عەرەبەکانی عیراق زۆر لە ئێمە ئاشکرا تر باسی‌جنسیان کردووەو ئەمە نابێتە کەموکووڕی ، بە مەرجێك وەکو کاك فوئاد گوتی بۆ مەبەستێکی ئینسانی بێت . چارەسەری لایەنێکی کۆمەلآیەتی پێ‌بکرێ . کەم ئەدیبیش هەیە لە ئەدیبە گەورەکان باسی جینسی نەکردبێ . بۆ نموونە مۆپاسان زۆربەی بەرهەمەکانی لەبارەی جینسەوەیە ، بۆیە مەسەلەی باس‌کردنی [redacted] ئاشکرایی لە چیرۆکی کوردی‌دا بە کەموکووڕی دانانێم .

● **کاك محمد فەریق حەسەن** لەبابەت پرسیارەکەوە گوتی : من دەمەوێ هەرباسی چیرۆکی ئێستا بکەم . یەکێ لەوکێشانەی کەیەخەی چیرۆکی کورتی کوردی گرتووە تەم و مژە ، تەم و مژێکی لەڕادە بەدەرو مەسەلەکەش مەسەلەی ئالۆزی فیکروبیری نووسەرە کە نازانێ کام ئایدیا چاکەو سەرلێشێواوە ، یاخود سواری کۆلی فیکرێ بووە لێی تێ‌ناگاو هەزمی ناکات . لەبەر ئەوە چیرۆکەکە ئالۆزە . یاخود هەر خۆشی لەکارو ڕەفتاردا ئالۆزە ، هەروەها یا چیرۆکنووسەکە بێ‌توانایەو ئەو تەم‌ومژە بۆیە دێتە کایەوە تا خەلك نەزانێ بیری ساویلکەو بێ‌توانایە ، کەچی دەبینین زۆربەی **چیرۆکنووسەکانی جیهان ــ ئەوانەی کەناسراون ــ باسی قووڵترین مەسەلەی ژیان بە زمانێکی سادەو ڕەوان دەکەن کە هەموو کەسێك لێیان تێ‌دەگات . بەلآم چیرۆکنووسی لای خۆمان کەلە پالمانا دەژی لێی تێناگەین باسی چیدەکات .**

ئەمە یەکێکە لەو کێشانەی کە چیرۆکی کوردی تیایا دەگلێتەوە .

شتێکی‌تریش لەتەنگوچەلەمەی چیرۆکی کوردی لەشێواز دایە ، واتە شێوازی چیرۆك نووسین . گەلێ جار دوو چیرۆکنووس یەك فیکریان هەیەو زۆر نزیکن لەیەکەوەو لەسەر زۆربەی شتەکان ڕێککەوتوون ، کەچی دەبینین هەرباسی یەك ڕووداویش دەکەن ، بابلێین باسی شەڕی دووەمی جیهانی دەکەن‌و باسی شارێکیش

لە وڵاتی خۆیاندا چی بەسەر هاتووە ، کەچی سەیر دەکەی ئەم دوو نووسەرە هیچیان لە هیچیان ناچن‌و هیچیان دەقی ئەوی تریان نین . ئەمە چی لێکیان دەکاتەوە ؟! بێ‌گومان شێواز ، وەك چۆن جیاوازی لەنێوان شێوازی نووسەرێك‌و نووسەرێکی دی‌دا هەبێ . بەڵام لەلای ئێمە زۆربەی چیرۆکنووسەکانمان لە شێوازدا تارادەیەك لاسایی یەکتر دەکەنەوەو جیاوازی نێوانیان کەمە . هەروەها شتێکی دیش هەیە ئەویش نەفەس کورتی‌و نەفەس درێژی چیرۆکی کوردی‌یە . هەندێ برادەر دەیانەوێ چیرۆکە زۆر کورتەکان بکە[illegible]یرۆکی کورت ، درێژی دەکەنەوە ، سەیردەکەی ئەو درێژکردنەوەیە زیادە . لێرەدا دمەوێ دوو چیرۆك بەراوردبکەم، یەکێکیان « گوراگی » کاك رەئووف بێ‌گەردە باسی دێیەك دەکات لەشاخا ، من وەك یەکێك کەلەناوچەی شاخاوی ژیاوم گەلێ هەوڵم‌دا بزانم ئەم دێیە چۆن هەڵکەوتووە ؟ دانیشتوانی نزیکەی چەند کەسە ؟ دێیەکە چەند دەبێ‌و دارو درەختی زۆر تیایە یان ڕووتەنە ؟ ئەو زەوی‌یە بەستراوەتەوە بە ئادەمیزادەکانی‌یەوە ؟ نزیکەی سێ چوار لاپەڕەی فولسکاب باسی دێکە دەکات ، کەچی هیچ لە دێیەکە تێنەگەیشتم‌و ئەو چوار لاپەڕە فولسکابە لابەین لایەنی چیرۆکەکە بەهێز دەبێ ، کەچی لەهەمان کاتا ــ هێرۆ گۆران ــ چیرۆکێکی نووسی بوو باسی دێیەك دەکات ، دەڵێ دێیەکە وەك مەدالیایەکە بەسەر سنگی چیاکەوە . ئەم ڕستەیە لەلای هەچ کەسێ باس‌کەی خێرا دەزانێ دێیەکە هی لای خۆمانە ، من یەکسەر دێلێژەو خاویەم هاتەوە بیر . ئەم ڕستەیە لەهەر چوار لاپەڕە فولسکابەکەی کاك رەئووف بەهێز ترە . باس‌کردنی داروودرەخت‌و شتەکان لاسایی‌کردنەوەی ناتالی ساروت‌و هاوڕێیەکانیەتی.

**لەڕاستیدا دەبێ باسی مرۆڤ بکەین‌و ئەوشتانە بێ مرۆڤ هیچ نین‌و دەبێ داروبەردو هەمووشتێ کە باس دەکرێن لە خزمەت‌و بەرژەوەندی مرۆڤ دابن . بۆ مەسەلەی پاڵەوانیش لە چیرۆکی کوردی‌دا هەندێ جار لەجیاتی ئەوەی ناوی پاڵەوان بێنین دەڵێین ئەم‌و ئەو ، ئەم گوتی‌و ئەو گوتی . ناو بەکار ناهێنین . خۆی لە ڕاستیدا ناو بوعدیك بەپاڵەوان دەدات . ئەگەر بڵێم « ڕەمەزان » ماناي ئەوەیە پاڵەوانەکە گەنجە .**

خوێنەری بەڕێز :

وا بۆ جارێکی دی بە یەك دەگەینەوەو لەم بەشەدا لە نا تەواوی‌و کەموکووڕییەکانی ئێستاو پێشووی کورتە چیرۆکی کوردی چین‌و چۆن چارەسەر دەکرێن لا دەدوێین‌و بە شێوەیەکی گشتی ڕووناکی دەخەینە سەر هەردوو لا بە تایبەتی باری چیرۆکی ئەمڕۆو کە چۆن بێ‌و چی بێت . ئێنر ئێوەو لێکۆڵینەوەی پرسیارەکە .

« بەیان »

**خو ئەگەر گوتم « مام ڕەمەزان » ماناي ئەوەیە پاڵەوانەکە پیرە . ئەگەر ناوێکی کوردی تازەت گوت ئەوە گەنجەو شاری‌یە ... هتد .**

وشەی ئەم‌گوتی‌و ئەو گوتی ئادەمیزاد دەکا بەتارمایی لەبەرانبەرت‌و ئەوە دەگەیەنێ ئادەمیزاد بەچاوێکی گەورە سەیر ناکرێ . مە لە چیرۆکی « کوێر ئۆغلی » گەلێ شت دەربارەی ئەسپ فێر بووم . چونکە ــ **یەشار کەمال** ــ ئەوەندەی مەیتەرێك زانیاری دەربارەی ئەسپ لەکوێر **ئۆغلی‌دا** پێشکەش کردووە . بەڵام چیرۆکنووسەکانی خۆمان وەها نین . بۆ نموونە چیرۆکێکی کاك عبدالله ئاگرین باسی ئەوە دەکا خەرمان دەسووتێ ، بەڵام نازانێ چۆن خەرمان دەسووتێ . یان باسی دەکات‌و نازانی شەمال لەکەی‌دادێ‌و وەشت لەکەیدا هەڵدەکا ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مەسەلەی زانیاری لەلای ئێمە کەمە . مەسەلەی تەکنیکیش ... زۆر کەسمان وخۆمیش بەوەدا دەنازم کە چیرۆکی ئێستا لەمەسەلەی تەکنیکا گەلێ پێشکەوتووە . بەچی‌دا پێشکەوتووە .. ؟! یەکەم دایەلۆج بەکار دێ ،

ئەوسا وانەبوو ، ڕستە پڕوچڕ دەکرێ ، جاران چڕو پڕنەبوو . « تداعي » هەیە جاران نەبوو ... هەروەها مەسەلەی لەقتەی سینەمایی بەکارهێنان‌و پانتۆمیم‌و گەلێ شتی تریش ؛ بەڵام ئەگەر بە وردی سەیریان بکەین ، دەبینین زۆربەی ( تداعي ) چیرۆکنووسەکانمان لە چیرۆکدا ( تداعي ) نیە ، گێڕانەوەیەو دەبێتە گێڕانەوە .. هەروەها دایەلۆگەکانیش بوونەتەوە بە گێڕانەوە بەڕاستی تەکنیکی ئێستای ئێمە ئەوە نیە کەلە خەیاڵماندایەو گەلێ کەموکووڕی ماوە . هەروەها بەتایەکی تریش وجوودیەتە کە چیرۆکی کوردی ◁

تێکەوتووە . وجوودیەت لە وڵاتی ئێمە کەلەشێری ناوەختە ، چونکە وڵاتێکی تازە پێگەیشتووین و دەبێ فەلسەفەیەك هەڵبژێرین و قازانجی بۆ میللەتەکەمان هەبێ و ئێمە هەتا ئێستاش شانازی بەنازناوو خێڵ و هۆزەکانمان دەکەین . وجوودیەت یەقدانەوەی نامۆیی و چەوسانەوەی سەرمایەداریەو وجوودیەت لەبەر پرسیاریی راکردنە . بۆ نموونە پاڵەوانی ـ یەقدانەوە ـی سارتەر دوانزەساڵ چاوەروانی گەڕانەوەی کچێك دەکات لە ئەفەریقا کە دێتەوە . ئەم ئەوەندە بەرەللایە پاش دوانزە ساڵ ، چاوەڕوانە ، لە فرۆکەخانە ناچێ بۆلای و بە خێرهاتنەوەی بکات و هەربەجێشی دێڵێ .. **بەرای من وجوودیەت دوژمنی میللەتی ئێمەیە ..** هەندێ نووسەر هەن ئاگادارنین کە بیری وجوودی لە نووسینیاندا هەیە ، لەمحاڵەتەدا ئەگەر رەخنەگران ئاگاداریان بکەنەوە شتێکی باشە .

● **کاك رەئووف حەسەن** لە کەموکووڕییەکانی چیرۆك دواو گوتی : کە گوتم یەکێ لە کەموکووڕییەکانی چیرۆکی کۆن گێڕانەوە بوو ، ئەو گێڕانەوەیە بواری داون وەکو **کاك صلاح شوان** گوتەنی کە کوێرەوەریو کلۆلی لەسەریەك بە ئاسانی ریز بکەن . من زۆر بەخۆ پاراستنەوە ویستم باسی کەموکووڕی چیرۆکی پێشوومان بکەم . بەتایبەتی گوتم هەندێکی زۆر کەمیان باسی میثالیەت و شتی میثولۆجی دەکەن . نموونە بۆ ئەوە چیرۆکی **احمد مختار جاف ـ مەسەلەی ویژدان** ـ هەروەها چیرۆکی « کەشکۆلی جادوویی » **حەسەن قزلچی** ، نموونەی‌کەش زۆرن وەکو چیرۆکی ـ گەشتێك لەسەر لوتکەیە بەرز ـی فایەق زێوەر .. ئەو چیرۆکانە ئەوەندە میثالییانە نووسراون من بە کەمو کووڕی دادەنێم .

لەباسی **رەمزیشدا** من گوتم : رەمزەکە بەکاری دەهێنن ، دەبێتە هۆی بێزار بوون ، چونکە رەمز لەلای ئێمە لە زۆر شوێندا بەدوو دیودا دەکەوێ . دیوێکیان دیوی دەرەوەیەو ئەوی دیکەیان ناوەوەیەو شیکردنەوەی رەمزەکانە ، ئا ئەم بارە کوێرەوەرییە تووشی چیرۆکی کوردی بووە ، نموونەش بۆ ئەمە زۆرە .

● **کاك عبدالله عەزیز** بەم شێوە لەپرسیارەکە دواو گوتی : قسەکردن دەربارەی کورتە چیرۆکی ئێستاو پێشووی کوردی دەبێ لەبارەی شێوەو ناوەرۆکەوە تەماشا بکرێ و بۆ هەردوو رووەکەش باش وایە بزانین لە چ لایەنێکەوە دەستنیشانی کەمو کووڕییەکان دەکەین . بۆمان هەیە ناتەواوییەکانی چیرۆکی کوردی لەگەڵ جیهانیدا بەراورد بکەین و بزانین ئێمە لەگەڵ ئەواندا لە چ ئاستێکداین ، دووەم بەراوردکردنەوەی چیرۆکەکانی خۆمان بەپێی قۆناغێك کە تیا ژیاوە. بۆ نموونە چیرۆکی سەردەمی گەلاوێژ پێش پەنجاو هەشت ، پەنجاو هەشت بۆ شەستو یەك ، شەستو یەك بۆ حەفتا ، حەفتا بۆ حەفتاو چوار ، حەفتاو چواریش هەیە .. گەر لەم ڕووانەوە بەراوردبکەین هەست بە هەندێ کەم و کووڕی دەکەین بەتایبەت لەڕووی تەکنیکەوە ، تەکنیکی هونەری ، لەڕووی ناوەرۆکەوە ئەگەر وەکو کەموکورتی سەیریکەم پێم وایە جۆرە ناهەقیەك بەسەر دەمەکە دەدەم‌کە چیرۆکەکەی تیا نووسراوە .

مەسەلەی چارەسەرکردنی کەموکورتی چیرۆکمان بەخواست و ئارەزووی ئەدیبەکانمانەوە بەستراوە . ئەمەش بەستراوە بە خواست و ئاواتی ئەوان و رادەی پیرۆزیی ئەدەب لەلایان ، ئەوانەی دلسۆزن و شتیان لەبار دایە هەوڵ دەدەن چیرۆکی کوردی لە هەموو لایەنێکەوە چڕو تێر بکەن ، هەروەها هەندێ باری ناتەواوی کورتە چیرۆکمان پەیوەندی بەباری ژیانی میللەتەکەمانەوە هەیەو ئەمەش لەسەر دەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دی جیاوازی هەیە ، چیرۆکنووسی پێشوومان کەوتبووە ژێر کارتێکردنی ئەدەبی عوسمانی ، بەڵام ئێستا بەهۆی پەخش و بڵاوکرانەوەو وەرگێڕان و رادیۆوە دەتوانین تازە ترین بەرهەمی چیرۆکنووسانی جیهان ببیستین یا بخوێنینەوە ، وابزانم ئێستا دەرفەتێکی باشتر بۆ چیرۆکنووسان لواوە گەربیانەوێ چیرۆکی کوردی پێش بخەن .

● **کاك فؤاد مجید** لەم ڕوانگەیەوە سەیری چیرۆکی کوردی و کەموکووڕییەکانی کردو گوتی : بەرای من چیرۆکی کوردی ئێستا لەتەنگوچەلەمەدا دەژی و چوەتە دواوە ، هۆیەکەشی ئەوەیە کە زۆربەی چیرۆکنووسەکان لە ئاستی ئەو هۆشیارییە دانین کە پێویستە ئەدیبێك هەیبێ .

بۆ نموونە ڕێبازە ئەدەبی‌یەکان نازانن وەکو ئێستا کاك أحمد محمد اسماعیل باسی‌کرد ، هەروەها هێڵێکی ئاشکراو ڕوون لەبەینی ئەو بەرهەمانەدا نیە کەیەك چیرۆکنووس دەیان نووسێ ، لە مەسەلەی تەکنیکیشدا چیرۆکی چلەکانو پەنجاکان زمانیان لە چیرۆکی ئێستامان بەهێزترو پاراو تربوو ، ئەگەرچی ئێستا چیرۆکنووسمان هەنە بە زمانی باش دەنووسن بۆ نموونە زمانی **کاك ڕەئووف** بێ‌گەرد زۆر پاراوە ، هەروەها **کاك مصطفی صالح کریمو کاك حمە فریق حسن** ، چیرۆکی ئەمانە بەزمانێکی ڕەسەنو باش نووسراون ، بەلاَم لەگەڵ ئەوەدا بەگشتی زمانی چیرۆکی ئەمڕۆ خراپە ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ زمانی چیرۆکی پێشوومان دەبینین ئەو زمانەکەی پاراوترە .

لەڕووی ڕێزمانو وێنەی هونەریشەوە هەر ڕەسەن ترە ، هەروەها لەڕووی ڕێکچوونیشەوە لەمەسەلەی مەنەلۆجو تەوژمی هۆشیشدا کە ئێستا لە کورتە چیرۆکی کوردیدا پەیڕەو دەکرێ، ئەگەر لێی بکۆڵرێتەوە دەبینین هیچ شتێك لەو هونەرە تازانەی چیرۆك بەتەواوی لەجێی خۆیدا بەکار ناهێنینو مەسەلەکە جەنجالە ، ئەوەی کە شایانی باسە هەندێ لێکۆڵینەوەش لەم بارەیەوە نووسراون ، لەگەڵ ئەوەشدا **کاك حوسێن عارف** لەیەك دوو چیرۆکیدا بەوەعیبەوە بەپێی ئەو ڕێبازەی پەیڕەوی کردووە تیایا سەرکەوتووە . مەسەلەیەکی تریش لەناتەواوی‌یەکانی چیرۆکی کوردی مەسەلەی لاسایی کردنەوەی چیرۆکی بێگانەیە ، چیرۆکنووس کە چیرۆکێکی بێگانە دەخوێنێتەوە خێرا پاڵەوانەکەی دێنێو ناوێکی خۆمانەی لێدەنێو جلو بەرگێکی کوردی لەبەر دەکات ، ئیتر بەتەواوەتی ڕووداوەکان هەر ڕووداوێکی بێگانەنو فیکرەکەشی هە فیکری چیرۆکنووسی بێگانەیەو ، چیرۆکنووس بەتەواوی لاسایی‌یەکی میکانیکی واقعێکی بێگانەی کردۆتەوە . بۆ نموونە **کاك ڕەئووف بێ‌گەرد** لە چیرۆکێکی‌دا باسی ئینسانێك دەکات لەناو هارەهاری مەکینەو دووکەڵدا دەژی ، ئەم واقیعە، واقیعی ئینسانێکی خۆمان نیە ، بەڵکو واقیعی ئینسانێکی کورد نیە ، هەروەها واقیعی چیرۆکی **ـ کنێر ـی حمە فەریق حسن** واقیعی ئێمە نیە . چیرۆکی تریش لەوبابەتە زۆرە بۆ نموونە چیرۆکە جنسی‌یەکان ، چیرۆکە جنسی‌یەکانمان بەشێوەیەکی زۆر نزم‌باسی جنس‌دەکەن ، هەروەها لە مەسەلەی فۆرمیشەوە کەموکووڕی هەیە ، بۆ نموونە **حوسێن عارف** لە چیرۆکی سەفەرێکی ئەفسووناوی‌دا بیستو چوار پاڵەوانی خستۆتە چیرۆکەکەوە ، کە ئەمە لە چیرۆکی کورتدا نابێ ... هتد .

● **کاك صلاح شوانیش** ڕای خۆی بەم شێوە دەربڕی : بەلای منەوە ناتەواوی‌یەکانی چیرۆکی کورتی ئەمڕۆمان زۆر کەمترە لەهی دوێنێ ، ڕەنگە هی دوێنێ تا ڕادەیەك ساکارترو ئاسانترو ڕەوانتر بێ ، بەلاَم ئێستا ڕەنگە نەختێ زەحمەتی تیابێ ، بەلاَم مانای ئەوە نیە کە چیرۆکی پێشوو لە هی ئێستا باشترە . چیرۆکی ئەمڕۆ سوودی لە هەندێ مەسەلەی تەکنیکی کردووەو تاڕادەیەك لەگەڵیدا گونجاندوویەتی ، دەڵێم تاڕادەیەك ، چونکە هەر لەسەرەتاوە تا ئێستا بەشێوەیەکی گشتی چیرۆکنووس نەیتوانیوە چیرۆکەکەی بخاتە چوار چێوەیەکی شیاوی خۆیەوە ، جا چ لایەنە هونەریەکە بێ چ مەسەلەی فۆرمو چ پێداویستەکانی مەنتیقی بۆ چیرۆکەکە .

ئەمە لە هەردوو سەردەمەکەدا هەیە . بەلاَم بەلای منەوە ئێستا لەپێشوو باشترە جاران چیرۆکنووس پاڵەوانێکی دەهێنا وەکو باس کرا ، سەیردەکەی جووتیارە ، بەلاَم وەك کادرێکی سیاسی قسە دەکاتو کۆمەڵێ ڕستەی عەرەبیش بەکار دێنێ ، ئێستا وا نیەو چیرۆکنووس تا ڕادەیەك تووشی ئەو هەڵەیە نابێ .. جاران گێڕانەوە زۆر باو بوو.

گێڕانەوە وەك شێوەیەکی هونەری چیرۆك جێی خۆیەتی بەکاربهێنرێ ، بەلاَم دەبێ ئەویش پێویستی‌یەکانی خۆی بۆ ساز بکرێ ، چونکە گێڕانەوە ، مانای ئەوە نیە بە ئارەزووی خۆت لەم لاوە بیبەی بۆ ئەولا ، بەڵکو گێڕانەوەش ڕێچکەی تایبەتی خۆی هەیە . ئەگەر وا نەبێ سەرنەکەوتووەو بەشی هەرە زۆری گێڕانەوەکانی جارانمان وابوون ، بێ ڕێچکە بوون .

چیرۆکنووسی ئێستامان تەنیا لەقتەیەکی ژیانی پاڵەوانو لە سنووری کاتو شوێنێکی تایبەتیدا دەدوێ ، بەلاَم کە دەڵێم ئێستا مەبەستم لە هەموو چیرۆکەکانی ئێستامان نیە ،

هەڵبەتە ئێستاش چیرۆکنووسی لاوازمان زۆرەو تەنها دەتوانین بڵێین لەم هەموو چیرۆکنووسانەی هەن ، چەند کەسێکیان زۆر سەرکەوتوون ، بەس لەوانەشدا هەریەکە چەند نموونەیەکیان زۆر سەرکەوتووە . ئەم زۆرو بۆرییەی ئێستا وای کردووە کە خراپی ئێستا لە خراپی جاران زۆر تربێ ، بەڵام بەدڵنیاییی باشەکانی ئێستا لەبابەتەتانی پێشوومان سەرکەوتووترن ، چ لەلایەن شێوەو تەکنیکو چ لەلایەن ناوەرۆکو چ لەلایەن هونەری چیرۆکیشەوە ، بەهەر حاڵ کەموکووڕی چیرۆکی کۆنو نوێی کوردی زۆر زۆرەو ڕەنگە هەر زۆر زەحمەتە باسی هەمووی بکرێ . بەڵام من هەوڵ دەدەم باسی دوولایەنی سەرەکی باس بکەم ، یەکەمیان ئەوەبوو گوتم بەکارهێنانی تەکنیك بگونجێ لەگەڵ ناوەڕۆکو مەبەستدا ، ئەمە لەپێشەوە هەبووە تا ئێستاش هەر بەردەوامە . سەیر دەکەین لە شوێنێکدا تەوژمی هۆش بەکاردێنێ کە پاڵەوانەکە هیچ پێویستی بەوە نیە ، سەیر دەکەی بە زمانێکی تارادەیەك ساویلکانە مەسەلەیەکی فیکری یا فەلسەفی دەخاتە ڕوو ، بێ ئەوەی بتوانێ هیچی لێدەر بخا ، هەروەها سەبارەت بە هەموو لایەنە هونەرییەکانی ترەوە زۆر جار ناتوانێ لە چیرۆکدا بە جۆرێکی گونجاو بەکاری بێنێ ، ئەمە خاڵێکی

سەرەکییە لە کەموکوورییەکانی چیرۆکی کوردیو گەلێ لایەنی لێدەبێتەوە . خاڵی دووەم بەلای منەوە کەمی تاقیکردنەوەی چیرۆکنووسی ئەمڕۆمانە بەرامبەر بە زۆری تاقیکردنەوەی نووسەرانی دوێنێمان ، واتە زۆری تاقیکردنەوەی هەندێ لە پێشەواکانی کورتە چیرۆك وای کردووە کە هەندێ جار لە سنووری کورتە چیرۆك دەرچێو ، گەلێ شت بخاتە چیرۆکەوە کە جێگای خۆی نەبێو لە سنووری کورتە چیرۆك دەرچێ .

کەمی تاقیکردنەوە زۆربەی چیرۆکنووسی ئەمڕۆشمان وای کردووە هەر تەنیا بچێ بەناخی خۆیداو دۆش دابمێنێو ئەوشتانە بڵێ کە تەنها خۆی هەستی پێدەکات .

● **کاك مصطفی صالح کریم** تێبینییەکانی خۆی ئاوا دەربڕین : کاك صلاح فەرمووی جاران پاڵەوانەکانی بە زمانی عارەبی قسەیان دەکرد ، تێبینییەکم هەیە تەنانەت دەشێ ئەو چیرۆکنووسەی ئەوەی گوتبێ وای گوتبێ بەزمانی پاڵەوانەکەوە : جومعەی دەکرد بەجوعمە و روبعی کردووە بە روعبو یاخود مزگەوتی کردووە بە جامیعو جگە لەوەش ئەمانە نموونەنو هەموو چیرۆکەکانی ئەو سەردەمە وا نەبوون . دەربارەی مامۆستا **محمەد فەریق حەسەن** کەباسی ئەوەی کرد شوێن پێی یەکتر هەڵدەگرین . ڕەنگە ئەمە نەنگی نەبێ ، بەڵام گرنگ ئەوەیە کەی دەتوانێ لەو بارە رزگار بێو کەسایەتی ئەدەبی بۆ خۆی دروست کات . چیرۆکنووسەکانی پەنجاکانمان دوای شێوازی عبدالملك نوریو فؤاد التکرلیو غائب طعمە فرمانو ذنون ایوب دەکەوتن . دەربارەی مەسەلەی جینسیش من یەك سەرنجم هەیە : ئێمە قسە دەکەین ، هەڵبەتە قسەکانی کاك فۆادیش لەسەر ئەوە نیە کە قەدەغەیە لەسەر جینس بنووسین ، بەڵکو مەسەلە ئەوەیە نموونەکان زۆر شاز نەبنو زۆر نزم نەبن ، ئەگینا لە ئەدەبی بەرزی جیهانیشدا نموونەی جینس زۆرە ، بەڵام مەسەلەکە چۆنیەتی چارەسەرکردنەکەیەتی .

● لە کۆتاییدا **کاك ئازاد عبدالواحد** رای **خۆی** بەمجۆرە دەربڕیو گوتی : بۆ نموونە چیرۆکنووسێکی وەك **ـ زکریا ثامر ـ** رۆژێ لە رۆژان تەسریحی نەداوە کە چیرۆکی ئیقاعی دەنووسێ . بەڵام ئێستا ئەوەی بینومانە ئەوەیە کە لە هەندێ گۆڤاری عەرەبیدا زۆر لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە کە ڕێبازێکی نوێی لەمەسەلەی ئیقاعدا دروست کردووە ، هەڵبەتە ئەمەیان وایە. خاڵێکی تریش هەبوو کە زۆر جاری تر من تێبینی ئەوەم کردووە کە ئەوانەی ڕەخنە لەبابەت چیرۆك دەنووسن دەیانەوێ هاوکێشەیەك لەنێوانی پاڵەوانی چیرۆکەکەو فیکری خۆیان سازبکەن . نووسەرەکە بیر لەوە دەکاتەوە کە ڕستەیەك لەناو قسەکانی پاڵەوانەکە بقۆزێتەوە کە بە سەلبی لە قەڵەمی بدات ، ئەگەر خۆی ڕێبازی وا بوو و هەڵوێستێکی سەلبی هەبوو . تەنانەت ئەگەر پاڵەوانەکەی پۆلیسیش بێ وا پێویست دەکات خۆیشی پۆلیس بێ .

**— ماویەتی —**

● بەشی پێنجەم ●

تۆمارێکی تایبەتی دەربارەی :

# کــــۆڕی شـــیعری نوێی کوردی

ئامادەکردنی : **صلاح شوان**

## پێشـــەکی :

**لە چوار ژمـارەی رابـــــــوردووی گۆڤارەکەماندا چـوار بەشی ئەم کـۆڕەمان پێشکەش‌کردن ، وا ئەم جارەشـــــیان بەشی پێنجەمتان دەخەینە بەردەست ، کـە بریتییە لــە وەڵام‌و بیروڕای مامۆستایان بەشدارانی کـۆڕەکە لەسەر پرسیاری پێنجەم ٠**

پرسیاری پێنجەمی کۆڕەکە لە دانیشـــتنی ســـێیەمدا خرایەروو کە دوا دانیشــــتنی کۆڕەکەمان‌بوو لە رۆژی دووەمیدا ، « صـــلاح شوان » پرسیارەکانی دەخوێندەوەو دانیشتنەکەی هەڵدەسووڕاند ..

● **صلاح شوان :**

پرســـــیاری پێنجەممان دەربارەی دەوری خوێنەری ئەمڕۆی شیعری کوردییە کە دەڵێت :

● **خوێنەری ئەمڕۆی شـیعری کوردی چی لە شـــیعر ئەوێت‌و ، چاکەو خراپەی ویستی ئەم خوێنەرە لەسەر شـاعیرانی ئەمڕۆمان چییە ؟** ●

◁

● **کەریم شارەزا :**

خوێنەرو گوێگری شیعر هەموو وەکو یەك نین‌و بە پێی چێژی شیعری‌و رادەی رۆشنبیری‌و زۆر شتی تریش دەگۆڕێن‌و جیاوازییان هەیە ،

بەلام جمهوورە گشتییەکە جۆرە تینوێتی شکانێکی دەم‌و دەستیان دەوێ ، بەلام شاعیری زیرەك‌و بەتوانا خۆی خوێنەر بۆ خۆی پەیدا دەکات‌و جمهوور وا لێدەکات بە دوای بەرهەمەکانیدا بگەڕێن ، نەك شاعیرەکە دوای جمهوورەکەی بکەوێت‌و بە پێی مواسەفاتەکانی ئەوان شیعر دابنێت ، چونکە ئەگەر بە پێی ئارەزووی جمهوور شیعری دانا شیعرەکەی تووشی چەندین کەمو کووڕی دەبێت‌و لە ئەنجامیشدا شیعرەکەی‌و جمهوورەکەشی لەدەست دەچێت ، بۆیە پێویستە شاعیر نەکەوێتە ژێر رەحمەتی جمهوورەکەیەوە ،

بەلکو جمهوورەکەی بەرزبکاتەوە بۆ ئەو ئاستەی دەیەوێ ، با لەسەر حیسابی هەندێ لەخۆبووردنی رۆژانەش بێت ، بۆ نموونە « گۆران » لە کۆنگرەی ئەدیبانی کورد لە شەقلاوە شیعرێکی خوێندەوە ،

تەنانەت زۆر کەس توانجیشیان تێدەگرت لەسەر ئەو شیعرەی ، بەلام شیعرەکەی من‌و خوالێخۆشبوو « ا. ب. هەوری » بە پێچەوانەوە بەلای زۆربەوە پەسەندبوو ، کەچی ئێستا شیعرەکانی ئێمە لە بیری کەسدا نەماوەو بۆ ئەمڕۆ بەکەلك نایەت‌و بە پێچەوانەوە شیعرەکەی « گۆران » هەر زیندووەو نرخی خۆی لەدەست نەداوە ، ئەو شیعرە ئەوسا خەلکەکە دەمودەست لێی تێنەگەیشتن بۆیە بە پیریەوە نەچوون ، کەچی ئێستا ئەبینین زۆر روون‌و ئاشکرایە ، ئەمە گوناهی « گۆران » نەبوو ، چاکیشی‌کرد بە پێی مواسەفاتی خەلکەکە شیعری دانەنا ئەگەرچیش دەیتوانی ، ئەگینا ئێستا ئەو جێگا بەرزەی نەدەبوو ، چونکە شیعری بەرزو چاك ئەگەر دەمودەستیش کاری خۆی نەکات ، ئەوەی بەسە کە نەمر دەبێت‌و بۆ ماوەیەکی درێژتر دەوری دەبێت‌و خزمەت دەکات ، بۆیە دەلێم دەبێ شاعیر ئاگای لەوەبێت نەکەوێتە ژێر رەحمەتی خوێنەرەوە ، بەلکو خوێنەر بەرزبکاتەوە بۆ ئاستی بەرزی شیعرەکانی با بۆ ماوەیەکی کورت یان درێژیش جمهوورەکە پێشوازیی گەرمی نەکەن ، گرنگ ئەوەیە دوای شیعرەکەی نەمربێت .

● **ئەحمەد هەردی :**

شیعر وەکو بەرهەمێکی هونەری‌و وەکو گشت هونەرەکانی‌تر مامەلە لەگەل مرۆڤ خۆیدا دەکات‌و بۆ مرۆڤەو مرۆڤ بەرەو رووی خۆی دەکاتەوە ، کە وا بوو مەسەلەی تێکەیشتن لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی‌ترو ، لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی‌تر ئەگۆڕێ . شیعری ئێستامان رەنگبێ لە رووی هونەرییەوە بەلای هەندێ خوێنەرەوە وا بکەوێتەوە تێینەگا ، یان بە یەك خوێندنەوە سوودێکی ئەوتۆی لێنەبینێت ، چونکە ئەمە پەیوەندیی بەرادەی رۆشنبیرییەوە هەیە .

جا ئەگەر شاعیر بێت‌و بە پێی رادەی تێکەیشتنی تێکرای خوێنەران شیعر دابنێت‌و بە ئارەزووی ئەوان بکات ، بێگومان شتێکی ساکاری لێدەردەچێت ، چونکە زۆربەی خەلکی لای ئێمە نەخوێندەوارن‌و پلەیەکی نزمی رۆشنبیرییان هەیە ، شیعری ئەمڕۆشمان جمهوورێکی رۆشنبیری ئەوێ‌و ، پێویستە هەولبدات بۆ زیاتر بەرزکردنەوەی هوشیاریی ئەو جمهوورەی شیعر دەخوێنێتەوە ، ئەمەش پەیوەندیی بە هوشیاریی شاعیرەکەوە هەیە بۆ ئەوەی وا لە شیعرەکەی بکات پێشەنگی کاروانی جمهوور بێت‌و ئاستی رۆشنبیریی خوێنەران بەرزبکاتەوە بۆ رادەیەکی هونەریی بەرز نەك دابەزێتە رادەی ئەوان ، چونکە ئادەمیزاد پێویستە پێش‌بکەوێت‌و بەرەو بەرزتر بڕوات ، نەك بە پێچەوانەوە .

● **محەمەد ئەمین پێنجوێنی :**

جمهوور هەموو لە یەك پلەی رۆشنبیریدا نین‌و یەك جۆرە چێژیان نییە ، جمهووری نەخوێندەوار چێژ لە شیعری نوێ وەرناگرێت .

حەز ئەکەم باسی ئەم لایەنەش بکرێت .

● **ع . ح . ب :**

شاعیر پێویستە بەر لە گشت شتێك زۆر چاك خۆی بناسێت‌و چووبێتە ناخی ئارەزوو و خۆشەویستی‌و رقەکانی خۆیەوەو ، بە باشی دەستی خستبێتە سەر چاکی‌و خراپییەکانی

خۆی‌و ، به دلسۆزییه‌وه به‌رامبه‌ر به خۆی شیعر بۆ خۆی بنوسێت ، چونكه شاعیر به‌شێكه له كۆمه‌ڵ‌و میلله‌ته‌كه‌ی خۆی‌و ، كاتێك كه شتێكی تایبه‌تیی خۆی ده‌رده‌بڕێت ، ئه‌وه شتێكی گشتییه ، جا ئه‌گه‌ر چاك بێت ئه‌وه لایه‌نێكی چاكه‌ی كۆمه‌ڵه‌كه‌ی پیشان‌ده‌داتو ، ئه‌گه‌ر سه‌لبیش‌بێت ئه‌وه واته ده‌ستی خستۆته سه‌ر كه‌موكوڕییه‌كی خۆی كه له هه‌مان كاتدا كه‌موكوڕییه‌كی میلله‌ته‌كه‌شێتی ، واته به گشتی شیعر ئه‌گه‌ر پڕ له راستگۆیی‌و دلسۆزی‌بوو ئه‌و شیعره سه‌ركه‌وتووه‌و ته‌عبیر له ره‌سه‌نیی ده‌كات .

**● حه‌سیب قه‌ره‌داغی :**

راسته خوێنه‌رانی شیعری كوردی یه‌ك پله‌و یه‌ك جۆر نین‌و ، تا ئیستا زووربه‌یان له پله‌یه‌كی نزمی رۆشنبیریدان ، بۆیه شیعردانان به پێی ئاره‌زووی خوێنه‌ر وا له شاعیر ده‌كا به جۆره‌ها شێوه‌و پله شیعر دابنێت كه ئه‌مه‌یش ناكرێ ، به‌لام شیعری ئیستامان به‌سه‌ر زۆر شتدا بازی داوه كه پێویسته ره‌چاو بكرێت ، وه‌كو ئه‌وه‌ی خوێنه‌ری شیعری كوردی گوێی به شیعری ساكارو راسته‌وخۆو به وه‌زن‌و قافیه راهاتووه ، چ شیعری كلاسیكیمان بێت یان په‌ندو قسه‌ی نه‌سته‌ق‌و گۆرانی‌و داستان‌و ئه‌م شته میللییانه بێت ، به‌لام شاعیره نوێكانمان هیچ ئه‌م لایه‌نانه ره‌چاو ناكه‌ن ، ده‌رهێنانی خوێنه‌ری شیعری كوردی له‌م راهاتنه كاتی ده‌وێ‌و رۆشنبیركردن‌و به‌رزكردنه‌وه‌ی ده‌وێ ، كه پێویسته حیسابی بۆ بكرێت .

لایه‌نێكی‌تری پرسیاره‌كه‌ش ئه‌وه‌یه ، به رای من شاعیر كه شیعر داده‌نێت پێویسته حیسابی خوێندنه‌وه‌و بلاوبوونه‌وه‌ی شیعره‌كه‌ی بكات‌و وای دابڕێژێت بلاوببێته‌وه‌و ، هه‌ر هیچ نه‌بێت له ده كه‌سدا سێ كه‌س تێی‌بگه‌ن ، ئه‌گینا شیعر بۆ ئه‌وه نییه بنووسرێت‌و كه‌س نه‌یبینێت ، دیاره ئه‌م حیسابانه‌ش كار ده‌كه‌نه سه‌ر راده‌ی داهێنان‌و سه‌ر بیركردنه‌وه‌و سه‌ر شێوه‌ی شیعری شاعیرانی ئه‌مرۆمان .

**● صلاح شوان :**

حه‌ز ئه‌كه‌م سه‌رنجتان بۆ لایه‌نێك رابكێشم كه پێویست به باسكردن ده‌كات ، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه هه‌ندێ شاعیر ئه‌وه‌نده‌ی ره‌زامه‌ندیی جمهووری ده‌وێت‌و ئه‌وه‌نده‌ی حه‌ز ده‌كات ئافه‌رینی بكه‌ن‌و چه‌پله‌ی ده‌موده‌ستی بۆ لێبده‌ن ، ئه‌وه‌نده مه‌به‌ستی ده‌ربڕینی راستی‌و پێشخستنی هونه‌ری‌و داهێنان نییه . بۆ نموونه له دووه‌م میهره‌جانی شیعری كوردیدا ئه‌م مه‌سه‌له‌ی چه‌پله سوالكردنه به‌لای هه‌ندێكه‌وه ئاشكرابوو ، هه‌ندێكی تریش بۆ هه‌مان ئامانجیش شیعریان خوێنده‌وه ، به‌لام به جۆرێكیان دارشتبوو هێمن‌و قووڵ كار بكاته سه‌ر خوێنه‌رو له ناخه‌وه جمهووره‌كه بگۆرێت‌و به‌ره‌و ئه‌و مه‌به‌سته هانی‌بدات كه ده‌یه‌وێ ، نه‌ك سه‌ركێش‌و هه‌رزه‌ئارانه — وه‌ك د. عیزه‌دین مسته‌فا له وتاری كۆتاییدا ده‌ستنیشانی‌كرد — ، جا حه‌زم‌كرد ئه‌م لایه‌نه‌ش بخه‌مه به‌رچاو .

**● شیركۆ بێكه‌س :**

به‌لای منه‌وه له پرسیاره‌كه‌دا له جیاتی وشه‌ی « خوێنه‌ر » وشه‌ی « جمهوور » بوایه باشتربوو ، چونكه « خوێنه‌ری شیعر » كۆمه‌ڵی رۆشنبیران ئه‌گرێته‌وه ، به‌لام « جمهوور » گشتییه .

وه‌ك وترا جمهووری شیعری كوردی چه‌ند چینێكن ، شاعیرانیش هه‌روه‌ها چه‌ند جۆره پله‌یه‌كن‌و هیچیان له‌وانی‌تر ناچن . مه‌یدانی شیعریش ئه‌وه‌نده فراوانه جێگای هه‌موویانی تیا ئه‌بێته‌وه ، هه‌ر له شیعری میللیی ساكاره‌وه تا شیعری هونه‌ریی وا كه تازه‌ترین ته‌كنیك به‌كارده‌هێنێت ، چونكه هه‌ر شاعیره‌و كۆمه‌ڵه خه‌ڵكێكی وه‌ها هه‌یه شیعره‌كه‌ی له هی ئه‌وانی‌تر زیاتر په‌سه‌ند ده‌كه‌ن .

به‌لام شیعر پێویسته به گشتی بۆ جه‌ماوه‌ر

بێتەو ئێش‌و ئازارو ، خۆشی‌و ناخۆشی‌و ، ژیانی ڕۆژانەیان دەرببڕێت ، بەبێ ئەوەی نرخە هونەرییەکەی خۆیش لەدەستبدات . چونکە شیعر لەلای ئێمە جێگای گشت شتێك ئەگرێتەوە، شیعری فۆلکلۆریمان هەر لە لای لایەی منداڵەوە تا ئەلسەفەی میللەتەکەشمانی گرتۆتە خۆو پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە گشت لایەنێکی ژیانماوە هەیە ، جا شاعیری ئەمڕۆمان ئەگەر بیەوێ جمهوور ڕووی تێبکات پێویستە بچێتە ناخی ژیان‌و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی ئەو جمهوورەوەو دەریببڕێت‌و چارەسەری بکات .

مەسەلەی شیعرو خوێنەر یەکێکە لە مەسەلە ئاڵۆزەکانی ئەدەب لە گشت جیهانداو پێویستە ئاوڕی لێبدرێتەوە ، بەڵام گرنگیش ئەوەیە شاعیر شیعرەکانی بۆ بەرژەوەندیی جمهوور بێت ئەگەر تێیشی‌نەگات . خوێنەری شیعر بە پێی قۆناغی پێشکەوتنی ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی‌و ژیان بە گشتی ئەگۆڕێت‌و ، خوێنەری ئەمڕۆ وەك هی پەنجا ساڵ پێش ئیستا نییە ، بۆیە پێویستە شاعیر جمهووری خۆی بناسێت‌و ڕوو لەوان بکات ، چونکە شیعر چەند خۆی لە خۆیدا مەبەستە ، ئەوەندەش هۆیەکە بۆ گەیاندنی ئەوەی شاعیر ئەیەوێ بە جمهوور . بەڵام شاعیریش وەکو گشت ئادەمیزادێك بە کۆمەڵێك بارودۆخی تایبەتییەوە بەندەو مەرج نییە گشت ئەوەی ئەیەوێ بە جمهوورەکەی بگەیەنێت بۆی برەخسێت .

دەربارەی ئەو لایەنەی کاك « صلاح شوان »یش هێنایە ئاراوە ئەڵێم : شیعر بۆ چەپڵە بۆ لێدان نییەو ، پێویستە بە ڕاستی لە ناو دەروونی شاعیر خۆیەوە هاتبێتە دەرێ .

بۆ مەسەلەی گوێ ڕاهاتنی خوێنەریش بە شیعری کێش‌و قافیەدار ، ئەتوانم بڵێم جمهووری ئیستا ئەو قۆناغەی بەجێهێشتووەو چێژ لە شیعری نوێ وەردەگرێت .

لایەنێکی‌تری ئەم مەسەلەیەش ئەوەیە کە من دڵنیام بە گشتی خەڵکی ئاسایی چێژ لە شیعری « قانیع » وەردەگرن وەك لە شیعری « گۆران » بەڵام ئەمەیش هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت « قانیع » لە « گۆران » شاعیرتر بێت ، بەڵکو بارودۆخی کۆمەڵگا کشتوکاڵییەکەمان وای‌کردووە وا بێت ، هەر یەکەشیان شێوەی تایبەتیی خۆی هەیە . بەلای منەوە شاعیر پێویستە هەمیشە هەوڵ پێشخستنی لایەنە هونەرییەکانی بەرهەمەکانی بدات‌و بە زمانێکی وای دابڕێژێت بە ئاسانی بە خەڵکەکە بگات ، چونکە زۆر جار شتی زۆر گەورە بە زمانێکی ساکاریش ئەکرێ دەرببڕدرێت .

● **عەبدولڕەزاق بیمار :** •

شاعیری ڕەسەن‌و هەڵکەوتوو هەمیشە پێش زەمانەکەی خۆی ئەکەوێ ، شاعیرانی وەکو « نالی »و « حاجی قادر »و « گۆران » ــ وەك مامۆستا « کەریم شارەزا »ش باسی کرد لە سەردەمەکەی خۆیاندا زۆر ناخۆشییان دیوە ، تەنانەت « حاجی قادر » تا دوای جەنگی جیهانیی یەکەم ئاوڕی لێنەدرابەوەو نرخی خۆی نەدرایێ چونکە لە شێوەو لە ناوەڕۆکیشدا پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو ، چونکە شاعیرێکی ڕەسەنە .

جا ئەرکی شاعیر ئەوە نییە چەپڵە بۆ خۆی پەیدا بکات ، بەڵکو پێویستە هەوڵبدات شیعری بەرزو چاك بڵێت کە بۆ بەرژەوەندیی خەڵکەکەبێت، ئیتر ئەگەر بۆ ماوەیەکیش نرخی خۆی نەدرێتێ لە دوایدا هەر ئاوڕی لێئەدرێتەوە .

هەندێ جار شەپۆلێکی نوێخوازی لە ئەدەبی ئەتەوەیەکدا بڵاودەبێتەوەو زۆر کەسیش لەوانەی دەستێکی ئەوتۆشیان نییە دێنە مەیدانەوە ، وەك لە شیعری عەرەبیدا ڕوویدا ، بەڵام پاشان هەر شاعیرە ڕەسەنەکان ئەتوانن بەردەوام‌بن ، جا بە شێوەی نوێ بێت یان کۆن ، چونکە شیعری چاك بە هەر شێوەیەك داڕێژرابێت هەر خۆی ئەسەپێنێ ، بە تایبەتیش ئەگەر بە زمانێك بێت نزیکی چێژو ژیانی خەڵکەکەبێت .

● گۆڤاری « پەروەردەو زانست »و یادی دەیەمینی ژمارە (١٨) گۆڤاری پەروەردەو زانست دەرچوو کە بەرێوەبەرێتی گشتیی خوێندنی کوردی بەسێ مانگ جارێك دەری دەکات .

لەم ژمارەیەدا کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەو وتارو شیعر بڵاوکراوەتەوەو کە ژمارەیەك نووسەر بەشداری‌یان تێدا کردووە .

لەو باسە ئەدەبی‌یانەی کە بڵاوکراوەنەتەوە نووسینێکە بەناوی وێژەی « کلاسیکی » یا « دێرین »ی کوردی . مامۆستا عبداللە شالی نووسیویەتی‌و ، زیاتر لە زاراوەی « کلاسیکی » دەدوێ ئەو گفتوگۆو تێبینی‌و رایانە دەخاتە بەرچاو کە لە کۆڕی شیعری کلاسیکی کوردی لە ڕۆژانی ١٤ ـ ی ١٦ ی نیسانی ١٩٨١دا بەسترا ، سەریان هەڵداو . لە دوایی نووسینەکەیدا دەڵێ : زاراوەی کلاسیکی مەرج نیە وەکو دکتۆر کامل البصیر باسی‌کردووە پەیوەندی تەنها بەرەخنەسازی چەشنە هۆنراوەیەکی شانۆگەری سازکراوی چەشنە هۆنراوەیەکی شانۆگەری شازکراوی ئەورووپی‌دا هەبێ بەڵکو زاراوەیەکە بۆ هەموو کارێکی نایاب‌و پەسند وبێ هاوتاوهێمن‌و ڕەسەن‌و تامدارو چەسپاو لەلقەکانی کۆمەڵایەتی‌و کەلەپوورو پەروەردەو وێژەو ئەنتیکەکان‌و مۆسیقاو هەموو جۆرە هونەرێکی وێژەو گۆرانی بەکار دەهێنرێت .

مامۆستا شێخ محمدی خاڵ لە وتارێك بەناوی « هیچێکی تازە لە ژێر تیشکی ڕۆژانی‌یە » ئەوە روون دەکاتەوە کە زۆربەی شاعیرو نووسەرانی خاوەن بەهرەو فرە بەرهەم ، بەرهەمەکانیان . هەر زادەی بیری خۆیان نین ، بەڵکو بەشێکی هێجگار کەمیان هی خودی خۆیانن لە هی تریان وەرنەگرتووە . بۆ چەسپاندنی بۆ چوونەکانیشی کۆمەڵێك بەڵگە بۆنموونە دێنێتەوە . « گەشەی ڕێنووس‌و زاراوە » هەڵدانەوەی چمکێکی ڕەوی کاروان ، نووسینێکە مامۆستا محمد صالح سعید نووسیویەتی تیایا باسی ڕێنووسی زمانی کوردی دەکات‌و ئەو هەوڵ‌و تەقەلایانەی کە تا ئێستا لەم ڕێیەوە دراون یەك‌یەکە لێ‌یان دەدوێ‌و تێبینی‌و سەرنجی خۆی بەرامبەریان دەردەبڕێ . خوێندنەوە چەمك‌و ئامانج‌و جۆرەکانی وتارێکی مامۆستا کەریم شارەزایە باسی چەمکی خوێندنەوەدەکات‌و نموونەی بۆ دەهێنێتەوە ، دوایی لە گۆڕانی چەمکی خوێندنەوە دەدوێ‌و دەیکاتە سێ قۆناغ ، هەروەها لە ئامانج‌و دەوری خوێندنەوە لە ژیانی تاك‌و کۆمەڵدا دەدوێ ، لە کۆتایی باسەکەیدا دێتەسەر جۆرەکانی خوێندنەوە ، لەم نووسینەدا مامۆستا شارەزا پشتی بەکۆمەڵێك سەرچاوەی کوردی‌و عەرەبی بەستووە .

« بە گوێرەی بۆچوونی تەفسیرکەران‌و تێروانینی تازە » لێکۆڵینەوە یەکە لە وەرگێرانی کاك قاسم حسن صالح کە ئەویش لە گۆڤاری « آفاق عربیة »ەی ژمارە (٤)ی سالی ١٩٧٩ وەریگێڕاوە .

بەبۆنەی دە ساڵەی تەمەنی « پەروەردەو زانست »ەوە چەند نووسەرێك رای خۆیان لەم ڕووەوە دەربڕیوە .

ئەمین فەیزی نووسینێکە کاك ئەحمەد تاقانە لە تورکی‌یەوە کردوویە بەکوردی . هەڵبەستی قوتابخانە کۆمەڵێك هۆنراوەی شاعیرانی کوردە کە بۆ قوتابیانی قوتابخانەیان داناوە کە بە پێی ئاست‌و رادەی هۆش‌و خوێندەواری‌یان دابەش‌کراون . لەو شاعیرانەی کە بەشداری‌یان کردووە : عمر عبدالرحیم‌و ، لەتیف هالمەت و، ع.ع. شەونم و، کاکە فەللاح عبداللە حمە سوور محی‌الدین‌و ، بێ‌کەس‌و ، زێوەرو ، گۆران‌و ، جمال شارباژێری‌و ، دلدارو ، کامەران‌و ، قانع‌و ، کەریم شارەزاو ، شێخ



سەلام « ن. » چـــەند نموونەیـــەکی چـــالاکیو بەرهەمەکانی بەڕێوبەرێتییەکەمان » کاك ســـامی عزیز رسول ئامـــادەی کــردووە . باسی ئـــەو چالاکییانە دەکات کە بەڕێوەبەرییەتیی گشـــتیی خوێندنی کوردی تا ئێستا نواند ووبەتی لەکۆڕی چاپکردنی کتێبی کوردیو کــــردنەوەی دەورەی ڕاهێنـــاندا . لەکۆتاییدا مامۆستا عثمـــان علي الشیخ محمـــد پێرستێکی گشـــتیی ناوەڕۆکی ژمارەکانی پەروەردەو زانـــــتی ئامادەکــــردووە لەیەکەم ژمارەیەوە تا ژمارەی حەڤدە ، بـــەشیژ عەرەبی گۆڤارەکەشی بریتییـــە لـــە دوونووسین یەکێکیان بەناوی ( المصطلحات العلمیة في التراث العربي )یە وەیە کە لێکۆلینەوەیەکە دکتۆر عبدالله الجبوري ئامادەی کردووە ، ئـــەوی دیکـــەیان بەناوی « المصطلح العلمي والتراث العلمي » ئەویش لێکۆلینەوەیەکە دکتۆر یوسف عزالدین ئامـــادەی کردووە .

**ئەدەبی بێگانان**

بەشی دووەمی « ئەدەبی بێگانان » دەرچوو کە مامۆستا عەزیز گەردی سەرپەرشتی دەکات . ئـــەم بەرهەمە لـــە بلاوکراوەکانی کتێبخانـــەی حەیدەرییە لەهەولێر . ئەوەی کە شیاوی باسە ئەم بەشە تایبەتییە بەچیرۆك ، ئەم هەنگاوەش خـــۆی لەخـــوێدا کارێکی بەجێیـــەو مایـــەی دلخۆشییە ، کـــە دەســـتەیەك وەرگێری لاو بەشداری لە وەرگێڕان بکەنو ئەمانەتی وەرگێڕان پەیڕەو بکەنو نووسەرێکی لێهاتووی وەك عەزیز گەردیش کە شارەزای زمانی ئینگلیزییە وەرگێڕانە کە هەڵســـەنگێنێو کەمو کووڕی چارەسەر بکات .

وەك خۆی لە مەرجی وەرگێڕانا چـــەند خاڵێکی سەرەکی دەستنیشان کردووە وەك زانینی زمانی زگاکو ڕۆشنبیرییەکی باشو چێژی ئـــەدەبی ناسكو بیرو باوەڕی نەتەوایەتی هەبێ کە مەبەستی خزمەتی زمانو ئەدەبی گەلەکەی خۆی بێو تا بەرهەمێکی وا هەڵبژێرێ کە سوودی نەتەوەکەی خۆی تیابێ . ئەمە جگە لەمـــە ئەمانەتی وەرگێڕان وەك دەسپاکیو ناونووسینی نووســـەرو ئـــەو سەرچاوەی کـــە لێوەی وەرگێـــڕاوە . ئـــەو وەرگێڕانەی بەشدارییان لە وەرگێڕانەکە کردووە ئەمانەن :

عەلی مەحموود جوکل کە چیرۆکی « تووکنە رمی »ی چیخەفی وەرگێڕاوە هەروەها حوسێن عەلی چیرۆکی سێ ڕۆژ چاوساغی کە هێلین کیلەر نووسیویەتی . قاسم محمـــەد فەتتاح چیرۆکی شاعیر : نووسینی : هرمن هسسە . سەتلی پیر لە نووسینی یوری زباتاتسکی . ســـەباح حمـــە رەشید وەریگێڕاوە . ئازاد حمە شریف چیرۆکی فەلامـــەرزێکی خۆپەرستەی وەرگێـــڕاوە کـــە نووسینی ئۆسکار وایلدە . رمووزنە . نووسینی :

م. گۆرکی . وەرگێڕانی : هیوا عومـــەر ئەحمـــەد جـــەنگاوەر . نووســـینی : ئارنست همەنگوای حاجی ئەحمەد وەریگێڕاوە . مردن لە ناو دارستاندا نووسینی شـــێرود ئـــەندرسن وەرگێڕانی : حسام کەریم بەرزنجی . هـــەندێ پـــەندی ئینگلیزی گۆڕینی رەشـــید عـــەبدوللا مستەفا .

هەموو چیرۆکەکان لەزمانی ئینگلیزییـــەوە وەرگیراون زمانەکەیان ڕەوانو پاراون . ئـــەم پرۆژەیە بەردێکی پتەو لەبناغەی بینای وەرگێڕان

له زمانی بیگانەوه بۆ سەر زمانی کوردی دادەنێ ، هانی وەرگێڕان دەدات کە بیر لە پرۆژەی گەورە تر بکەنەوەو خۆیان بە وەرگێڕانی لێکۆلینەوەی بەپێزو قوول بکەنــەوەو بەرهەمی نووســەری گەورەی جیهانی وەربگێڕنە سەر زمانی کوردی وەك لەم پرۆژەیەدا پەیڕەویان کردووەو ، کاك مومتاز حەیدەریش جێگەی سوپاسە کە ئــەم پرۆژەی گرتۆتە ئەستۆی خۆیو چاوەڕوانی بەشی سێ دەبین .

**یانەی دڵان**



دیوانی هۆنراوەکانی « حــەمە عــەلی مەدهۆش »ە کاکە حەمەی مەلا کــەریم ئامادەی کردووەو پێشەکی بــۆ نووسیوە . دەزگــای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی یارمەتیی لــە چاپدانی داوە .

لەپێشەکی‌یەکەدا کاکە حەمە لــە شاعیرو هۆنراوەکانی دەدوێو ڕووناکی دەخــاتە ســەر شیعرەکانیو دەڵێ : مەدهۆش شاعیرێکی حازر بەدەستە . لەگەڵ کەرەستەی شــیعردا ، وەك لەگەڵ پارچەی قوماشدا ، مامەڵە دەکا . چۆن ئەو پارچــە قوماشە مردوە ئــەکا بەجوانترین سیپاڵو چــەند قات پتر جوانیی جوانانی پێ دەرئەبڕێ ، هــەروا ئــەو بەیەك‌گەیشتنە زۆرە هەموو رۆژێ دووبارە بووانە کە ڕەنگ بێ لای زۆر کــەس وەك شتێکی عــادەتی روو بدەنو بەسەربچنو ئەو بیرانەی لەو کاتانەدا بەخەیاڵدا دێن ، لە شێوەی ناسکترینو پڕسۆزترین شیعردا ئەهونێتەوەو پێشکەشی خوێندەوارانی ئەکا » .

هەروەها دەڵێ : مەدهۆش ئەوەندە بەزمانی خەڵك شیعر ئەڵێ گەلێ جار زاراوەی تایبەتیی ناوشاری ســلێمانی لا ئــەبێ بەزمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کورد . » ئــەم خاڵــەش بــەلای نووسەرەوە لاوازی‌یەکی زەقە بەهەندێ شیعری مەدهۆش‌دا دیاری دەدا .

دوای ئــەم پێشەکی‌یە شــاعیر کورتەیەك لەژیانی خۆی دەخاتە بەردەم خوێنەر کەمێك لــە شیعرەکانی خۆی دەدوێ پێی‌وایە چۆن زەوق لە بەقامی و جوانیی شیعرێك وەرگــرتووە ئاواش زەوقی لەجوانی دروونەکانی وەرگرتووە ، واتــە هەردوو جوانی‌یەکەی تێکەڵاو دەکــاو تەقــەلای بنیاتنانی ساختمانی هۆنراوەکەی دەدا . وا دیارە شیعرەکانی هەموویان لەگەڵ بیروباوەڕی خــۆی بەرابەر بنو کە کەوتۆتە بەر لیشاوی شیعر خۆی پێ‌رانەگیراوەو نەهاتووە دەسکاری شــیعرەکانی نەکردووە ... زۆربەی شــیعرەکانی واقیعینو ڕەنگدانەوەی ژیانی تایبەتی شاعیرن .

ئەم دیوانە قۆناخی جیــا جیای شاعیرن ، هۆنراوەی ١٩٣٩و ١٩٨١یشی تیایە ، زۆربــەی ئەو کۆمەڵە شیعرانەی کــە لــەکاتی خــۆیدا بلاوی‌کردۆنەتەوە وا جارێکی دی لــە دووتوێی یانەی لاوان چاویان هەڵدێنن .

گەشتێت بەناو ئەم دیوانە دەمانخاتە بەردەم ئەو ڕایە کە مەدهۆش شاعیری دلداری‌یەو بــۆ شیعری دلداری خولقاوەو تا ئێستا لەوەتی دەمی لە شیعری دلداری داوە نەکۆڵاوەتەوەو لەســەر هەمان ڕێچکەدا بەردەوامەو شیعرەکانی تامو بۆ یــەکی تایبەتی هــەیە . خاوەن شەخسیەتێکی جیاوازی خاسیەت دارە کە لــە شاعیرێکی تر ناکات .

لەم کورتە پێناسینە هــەقی تایبەتی نادەین بەشاعیر دەرفەت بێ ، بەدرێژی لــە ســەری دەنووسین .

# پۆستەی بەیان

م . ھ .

● چوار پارچە شـــــیعری جـوانمان بۆ هـاتووە ، خـاوەنیی دوانیـان دراوە بـە ناوێـكو ئـەو دووانەكـەی دیكەش هەریەكەیـان بە ناوێك .

ئێمە هـەرچی تەماشای جۆری نووسینەكەو شێوەكەی دەكەینو لە نـاوەرۆكو جۆری واتاكشتییەكانیان ورد دەبینـەوە بـە هی یـەكێكیـان دەزانین ، بۆیە بـە دوو دلیـــەوە هاتینە سەر ئەوەی كە بڵێین خاوەنی بەهرەی وەها و وشەی رازاوەی بە سۆزی وەها هەرگیز نابێ خۆی لـە خەڵك هەشـــاردا ، جـا ئاواتـە خوازیـن ، ئەگـەر وابێ ، خـاوەن هۆنراوە بەبێ پەرواو نـازایـانـە ، دڵسۆزی وشـــــەی كوردیی بێو شانازی بە ئەدەبو ئەدەبدۆستانەوە بكاو خۆیی لێمان ئاشكرا بكاتو واز لە نێوی جۆراو جۆر بهێنێ .

**ئەمەش ناوونیشـــان پـارچـە شیعرەكانن :-**

**١ ـ چوار وەرزی هێلانە .**

**٢ ـ ورشەی ئەستێرەكان .**

**٣ ـ چوار وەرزی خۆشەویستی .**

**٤ ـ سووتان بۆ ئەڤینەكەم .**

★ بۆ خاوەنی هۆنراوەی « جەژنی کرێکار » . ئەگەرچی بەرهەمەکەت لە وەختو وادەدا نەگەیشت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێشنیازت بۆ دەکەین کە زۆر لە هۆنراوەی بۆنە بخوێنیتەوە بۆ ئەوەی کەرەسەی شیعر رازانەوەت بەهێزو بە تامو بە سۆزبێ .

**★ بەڕێز ، خاوەنی هۆنراوەی « بەڵێن بۆ یار » ، دیارە پەلەت کردووە ، چونکە پێومبۆ زۆر دیارە کە کەمت خوێندووەتەوەو زۆرت نووسیوە ، ئومێدەوارین کە لێمان زیز نەبی ، هەوڵو تەقالایەکی بێ پایانی خوێندنەوەی ئەم جۆرە بابەتە بدەی ئەوجا بیرەکەت داڕێژی ، ببوورە .**

★ بەڕێز خاوەنی چیرۆکی « دووکەڵی نووزە » دیارە لێمان دەبووری ئەگەر وتمان چیرۆکەکەت هیچ مەرجێکی پێویستی چیرۆکی تێدا نیە ، هەروەها زمانەکەش لەق دەکا ، جا پێشنیازمان وایە کە کورتە چیرۆکی خۆماڵی و هی بێگانە زۆر بخوێنیتەوە ئەوجا دەست بدەیتە چیرۆکنووسین .

**★ بۆ خاوەنی چیرۆکی « لانەکەی پیرۆز » . چیرۆکەکە قسەی بەر ئاگردانە و واتای جۆراو جۆری هەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا ، رووی بلاوکردنەوەی نییە .**

★ بەڕێز خاوەنی هۆنراوەی « شەوێك لەگەڵ ئەلبومەکەم » ببوورە کە ئەڵێین ، تا بۆت ئەکرێ هۆنراوەی زۆر بخوێنەرەوە ، زۆری لێ لەبەر بکە ، تاوەکو کەرەسەی شیعرت زۆربێ ئەوجا هەستو سۆزەکەت لە نێو بۆتەکەیدا بتوێنەرەوە .

**★ بۆ خاوەنی پارچە شیعری « نالەی دووری » ، داوای لێ بووردنت لێ ئەکەینو دەڵێین ، پارچەکەت ، رووی بلاوکردنەوەی نە لە رووی ناوەرۆکەوە نە لەرووی هونەرییەوە نییە ، بەڵام بێگومان هەستو سۆزێکی شیعریت هەیە و ئەمیش بە خوێندنەوەی زۆر سەر دەر دەهێنێو گەشە دەکات .**

★ دۆستی گۆڤارەکەمان کاك « طالب یوسف حسن علی » لە لە پارێزگای « تأمیم »ەوە پارچە هۆنراوەیەکی جوانی بە ناوونیشانی « گیانە »وە ، بۆ ناردووبن وا لێرەدا کۆپلەیەکی لێ بلاو دەکەینەوەو بە ئومێدی ئەوەوە ئەگەر لە دوا رۆژدا پاشکۆیەکی تایبەتی بە بەرهەمی لاوانەوە دەرکرد ئەویش بلاو بکرێتەوە .

**زەوی ژان ئەیگرێو ئەزێ**
**کانییەك لە دایك ئەبێ**
**ئەمامێ لە پاڵیا شین دەبێ**

**هەموو رۆژی دەیان کانی عیشقت**
**لە ناخما ئەتەقێ**

**کەچی سەرووی باڵات تەنها**
**چرۆیەکی لێ پەیدا نابێ .**

★ بەڕێز خاوەنی هۆنراوەی « نالەی دووری » ، پێشنیازمان وایە کە زۆر زۆر بخوێنەرەوەو زۆریش بپرسی ، ئەوجا بنووسی ، وەك مامۆستا گۆران وتوویەتی .

**★ بۆ خاوەنی پارچە هۆنراوەی « پەشێو » ، برا ، لێمان ببوورە پارچەکەت رواڵەتی بلاوکردنەوەی نییە ، پێشنیازمان وایە زۆر زۆر بخوێنیتەوە ئەوجا بهۆنیتەوە .**

★ برا ، ئەی خاوەنی پارچە هۆنراوەی ( نالەی دووری ) سۆزی هەناسەکەت دووکەڵاوییە ، بەڵام

دارشـــــتن‌و ئاوازەکەی رێی بلاو کردنەوەی نادا ، ببوورە .

★ بـرا ، ئـەی خـاوەنی هۆنراوەی « گوڵێکی کۆچ‌کردوو » ، لێمان دەبووری ئەگەر بڵێین ئـەوا هەر لەبەر دڵی تۆ ئەم هەڵبژاردەیەت بۆ بلاو دەکـەینەوە ئەگینا رووی بلاوکردنەوەی هێشتا هەڵنەمالیوە.

**کەی گـوڵ بەهـاری ژیـان**
**دەگەرێتەوە نـاو گوڵزاری جوان**

★ بۆ خاوەن وتاری چەند وردە سەرنجێك ، وەك بیر ، وتارەکـە هەڵیگرتووە ، وەك دارشتن‌و رێك‌و پێکی‌و زمان ، هێشتا هەر نەریك‌و کاڵ‌و کورچە ، جا پێشنیازمان وایە کە دەربارەی رەخنەو رەخنەسـازیی زۆر بخوێنیتەوە ئەوجا دەسـت بکەی بەو جۆرە نووسـینانەو دڵنیایشین لەوە کە پاشـە رۆژێکی باشت لەم رووەوە دەستگیر دەبێ ، ببوورە .

**★ بۆنە ، هاتۆتە پێشـەوەو هـانمان دەدا ، کـە وەك ئەرکی سەرشانی خۆمان‌و وەك پێشنیازێکی سـوودبەخش بۆ هەر کـەسێ کـە حـەزی لـە وەرگێرانـەو دەیـەوێ . دڵنیای گەشـەی پێ ، داواخوازین بە هەڵدانێکی تەواوی ناوونیشـانی ئەو سەرچاوەیە کـە ئەو بەرهەمەی لێوە وەردەگێرێ ، چونکە ئـەگـەر واتەبێ‌و ئەگەرچیش وەرگێرانـەکـە سـەر لەبەربێ ، هـەر بە لووتەلایی تەماشا دەکرێ ، بۆیە تا لێرەش‌دا دەس باسمان دەکەینە کاك ( سەفین عبدالله ) خاوەنی پارچە هۆنـراوەی وەرگێــڕراو ( لــە ئاگــردانێکی بچووك - دا )و ئومێدەوارین لـــە بلاونەکردنەوەی ، ببوورێت .**

★ بـرا ، خـاوەنی چیـرۆکی ( ماری رەشــە ) ، با لە نێومـانـا دەرنەچێ ئەمە چیرۆکی بەرئاگردانە، سـەرزەنشـتی ژن دەکات ، ببوورە لە بلاو نەکردنەوەی .

**★ هۆنراوەی ( ســـــۆزی نیشتمان ) زۆر نەبێ کەم ســـۆزی نیشتمانپەروەریی بـــە شـێوەیەکی بچڕ بچڕ هـەڵـگـرتـووە ، بـەلام ئەوشـــەکان لایقی هەلگرتنی ئەم بیرەنەو نە ئاوازەکەشی ئەوجا ، برای خـاوەن « ســۆزی نیشــتمان » باشــترین رێگات بەلای ئێمەوە ، تەنیا خوێندنەوەی زۆرەو پرسـین بێ پایانـە ئـەم بەهرەیە دەرۆێنێ‌و گەشەی پێ دەکات .**

★ بـرا ، خاوەنی هۆنـراوەی ( هەستێکی نامۆ ) ، ببوورە ئەگـەر بڵێین ، هۆنراوەکە هەر تەنیا ئەمەی رووی بلاوکردنەوەی هەیە کـە وا لێرەدا بۆی بلاو دەکەینەوە :

**« نەخـۆم ئەتوانم دەری برم**
**بۆیە .. لـە نێوان خـۆم**
**قیژەی ئازاری حەزەکانم**
**شـــێتانە هاتۆچۆ دەکەم »**

★ هاورێی « بەیان » خاوەنی هـۆنـراوەی « بـەلگە » داوات لێ دەکەین ئەگەر لەمەولا بەرهەمت بـۆ ناردین ناوونیشـــانی تەواوی خۆت لـەگـەڵیا بنێرە ، وا ئیســـتەش وەرگرتـەیێ لـە هۆنراوەکـەت بلاو دەکەینەوە .

**« گەر لەو گوڵەی کە بۆم ناردی**
**بەهـــارێکی رەنگاو رەنگ‌و**
**چەپکێ گوڵی زەردو ســوورو**
**چیایەکی پڕ ســــۆزەگیات**
**بەدیی نەکرد ، بیبورینە » .**

# لەرجارەی نووسینێك

## دەنگدانــەوە

**هەر گەلێکی رەسەن کەلەپووری نەتەوایەتی‌و فولکلوری میللی خۆی هەیەو شانازی پێوە ئەکا ، میللەتی کوردی ئێمەش ســەدان ساڵە لەگەڵ برا عەرەبەکانیدا لەم عیراقە ئازیزەدا پێکەوە ژیاون‌و تاڵی‌و سوێری‌و خۆشی ژیانیان چەشتوە ، هــەر یەکی لەم دووانەش هەندێ شــتێ تایبەتی خۆی هەیــە ســیماو خاسیەتی میللی خۆی هەیە بەندە بەباروودۆخی ناوچەکە لە گشت بارو روویەکەوە بەڵام ئەمەش ئەوە ناگــەیەنێ کــە ئێمە لەیــەك جیاوازین بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو راســتی‌یە ئەچەسپێنێ کە ئەم دوو میللەتە لە خاکی عیراق‌و لە ئاوی عیراق‌و لە کەش‌و هەواو خێری‌و بێری عیراقدا هاوبەشن هەردووکشــیان لەیەك کانی‌دا ئاو دەخۆنەوەو چاویان بڕیوەتە یەك ئاوات .**

**پاش گەرانەوەم لە سەفەرێکی خۆش‌و پڕ لە هەســتێکی بەختیــارانــەی فیســتڤالی رۆشــنبیری‌و هونــەری کــوردی کــە لــە هەولێر ساز کرا .. بڕیام دا بڕۆم سەرێ لە کۆنە ( ئەلوەن )ی ئازیز بدەم ، لەو سەردانە بۆ خانەقی سواری پاسێك بووم دوو گەنج لە تەنشــت شوفێرەکەوە بوون ، داوای کاسێتێکیان لێ‌کرد ، شوفێرەکە وتی :**

**ـــ وە خودا من کاســێتیکی تازەی کوردی رەسیبەسە پیم ، فرەش خۆشـــەو فرەش دەگمەنە ..**

کاسێت لێ درا باش گوێم لێ گرت‌و زانیم ئەمە کاسێتی میهرەجانەکەی خۆمانە ..

پێم وت :

**ـــ کاکە ئەم کاسێتەت لە کوێ هاوردیە ؟**

وتی :

**ـــ لە هەولێر ناردنەسەی ئەرام .. ئێژن هین مەهرەجانی کوردی‌یە لە هەولێر کریاس .. بەس ...**

وتم : بەس یەعنی چە !

وتی :

**ـــ کــاکــە ئێژم گۆرانیەکانی ( حمە قوتی ) بەس خۆشــــــە .. چونکە خۆمــانی ئەیلێ‌و ئاوازەکانیش بۆ ڕەش‌بەڵەك پورت‌و پڕە لە هورەی جافی ..**

وتم : بۆ ؟

وتی :

**ـــ چونکە گۆرانیــەکانی تری ئاوازەکانیــان نــازانم چۆن چۆنی‌یە .. خەریــك بوو بڵێ جوان نی‌یە .. بەڵام بۆم باس‌کرد کە ئەو ئاوازانە لــە سەردابەشکردنی تازە دانراون .**

وتی :

**ـــ کاکە : شوکر ئێمە بەســایەی شۆرشی تەموزو بە سەرۆکایەتی کاکە صدام هەموو شتمان بۆ هەیە ، نەك وەکو براو ئامۆزەکانمان لە ئێران‌و سوریا هەموو شــتێك لێ‌حەرام کراوە .. بگرە هەتا مۆسیقایاشیان لێ حەرام کراوە ..**

بەڵێ .. لە کوردستانی عیراق میهرەجــان ساز ئەدرێ .. مرۆڤی کورد بە مافە رەواکــانی خۆی شادمانە .. دۆســتایەتی دێرینەی کوردو عەرەب ڕۆژ لەدوای رۆژ لە ســایەی شۆرشی ١٧ – ٣٠ تەموزو لە ژێر باڵی‌میهرەبانی ســەرەك صداما بتەوتر ئەبێت .. سیماو خاســیەتی نەتەوایەتی کورد پتر ڕەگ دائەکوتێت‌و لە بەهاری برایەتیا شێرە بەفرینەکان ئەتوێنەوە .. ئــەمــە حاڵی ئێمەیەو ئەوەش حاڵی ئامۆزاو خاڵۆزاکانی هەندەرانمان .. !

**اکرم محمود سمین**

